

## دەربارەی وەرگێڕان

# محەمەدی قازی کێیە و چیی کردووە؟



هەڤپەیڤین
سەید عەلی ساڵحی

وەرگێڕانی لە فارسییەوە
ڕێباز مستەفا

ناوی کتێب: محەمەدی قازی کێیەو چیی کردووە؟

ئامادەکردنی: سەید عەلی ساڵحی

وەرگێڕانی: ڕێباز مستەفا

بابەت: گفتوگۆ

بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان فەرەج

هەڵەچنی: سازان قادر

بەرگ: قادر میرخان

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد ڕەفیق

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخی: ١٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ٨٢٤ ی ٢٠٠٥

چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٦

کوردستان -سلێمانی

www.sardam.info

دەربارەی وەرگێڕان

# محەمەدی قازی کێیەو چیی کردووە؟


هەڤپەیڤین

**سەید عەلی ساڵحی**

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

**ڕێباز مستەفا**



سلێمانی ٢٠٠٦

## دەروازە:

لەم گۆشەی زیاندا، ئێمە هەموومان لەسەر شارێی مەزنی دۆزینەوەو هەڵبژاردن‌و شکۆو هەنگاونانماندا یا لە چاوەڕوانیدابین یاخود لە سەفەر. دڵمان لەنێو خورپەو ترووسکاییدا لێیدا. ئەگەر گومانمان لە دوێنێمان هەبووبێ، ئەوا بڕوامان بە سبەینێمان بەهێزەو خواستی هەموومان ڕووەو ڕێگاو پێنگاوو چارەنووسێکە کە "مرۆڤ" بەرەو پێگەیشتن‌و هەڵکشان ڕێنوێنی دەکات، بەڵێ هەمان ئەو مرۆڤەی کە سەرەنجام چاو لێك دەنێ‌و ئەم ژیانە جێدەهێڵێ‌و کە چاویشی لێك نا دەسپێردرێتە ڕابردووەوە، بەڵام ئاگامان لەوەش هەیە کە زۆرن ئەوانەی بە زیندوویی دەمێننەوە، ئەوانەی ڕۆڵەکانی داهاتوو ئاوازی ڕۆحی پڕ لە داهێنانیان دەڵێنەوەو بە سۆزو گەرم‌و گوڕییەوە دەیکەن بە سترانێك کە مەرگیشیان هەر بەردەوامی‌و درێژبوونەوەی بوونە پڕ بەهاکانیان دەبێت.

لێرەشدا قسە لە بارەی مرۆڤێکی لەو چەشنەیە. قسە، ئەویش سەبارەت بایەی قەڵەم‌و هەنگاوێکی ئاوا ڕاشکاو و خێرا. بۆیە لەو باوەڕەم کە وەها مرۆڤێك، چرایەکی ڕووناکی بەخشە لەنێو تاریکاییەکی بێ کۆتاییدا، کە هەم تاریکییەکەی شکاندووەو هەم دەستپێکێکی مایەی سەرسامبوونی داهێناوە. دایهێناوە تاکو بمێنێ، بەڵێ بۆ سەدان ساڵ بمێنێ.

کەوایە بە پێی ئەو پاڵپشتە و دڵنیابوونەوە، من وەك کەسێك کە شێلگیرانەو بە شێوەیەکی بەردەوام‌و بە گوێرەی توانای خۆم لە شیکردنەوەو بەدواداچوونی هونەرو ئەدەبیاتی نیشتمانی خۆمدا لە

هەوڵدان‌و چالاکیدا بەشداریم هەبووە، رایدەگەیەنم کە لە جێی خۆیەتی ڕێز لەو مرۆڤە بگیرێت کە ئاوا لێبڕاوانە ڕەنج‌و ماندووبوونێکی زۆری لە پێناو ئەدەبیات‌و هۆشیارکردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ کێشاوە، ڕێزگرتن ئەویش ڕێزگرتنێکی فراوان‌و هەمەلایەنەی کۆمەڵی هۆشیارو خوێندەوارو ئەهلی قەڵەم.

من، محەمەدی قازی دەڵێم. ئەو پیاوەی کە نموونەو ئۆلگوی تەواوی خۆشەویستی بۆ مرۆڤ‌و قەڵەم‌و ئازادییە.

محەمەد قازی بەو خەسڵەتە تایبەتیانەی کە لە کەسایەتیەکەیدا هەن، هەر لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەیدا، بۆت ساغ دەبێتەوە کە کەسێکە خاوەنی بڕیار، جۆش‌و خرۆش، باوەڕ، تواناو بیرکردنەوەیەکی کاریگەرانە، کە هەڵبەتە ئەو ساغبوونەوەیە ڕاست‌و دروست‌و لە جێی خۆیەتی. سیمای گشتیی ئەو وەرگێڕە مەزنە بە هۆی دوورکەوتنەوە لە خۆهەڵکێشان‌و زیادەڕۆیی‌و بە هۆی ئەو پاڵپشتە بێ خەوشەی کە لە کەسێتیی کۆمەڵایەتی فەرهەنگیی خۆیدا هەیەتی، هەمیشە سیمایەکی ڕۆشن، خۆشتڤیانەو مایەی دەرک‌و سەرنجڕاکێشانە، سەرنجڕاکێشانێك کە لە تایبەتمەندیەکانی بوونی ئەودا هەیە، لە هەر ڕووبەڕووبونەوەیەکدا لەگەڵی، حەزو شەوق بە بوون‌و ژیان لە مرۆڤدا زیندوو دەکاتەوە. محەمەدی قازی گورزە.

* * *

## لە جیاتی پێشەکی:

ڕۆژێکی گەرم بوو، پێموابێ مانگی ئاب بوو، ئابی ١٩٧٩ لە پلیکانەکانی هوتێلی لۆزان بەسەرکەوت. برادەرێك ئێمەی پێك ناساند: "محەمەدی قازی". بە لامەوە سەیر بوو- دەتوت ساڵەهای ساڵە کە ئەو پیرەمێردە سەرو ڕیش سپیە میهرەبانە دەناسم. ئەوەندە بە زەوق‌و پڕ جۆش‌و خرۆش بوو، مرۆڤی دەخستەوە یادی "زۆربای یۆنانی". قازی ئەوە بوو کە بیرم لێکردبووەوە. پاڵپشتی پەیوەندییە ڕۆحییەکانی لەگەڵ خەڵك، غەزەل بوو، عەشق بوو، بزەو زەردەخەنە بوو و هێشتاش، بەڵێ هێشتاش هەر بە هەمان شێوەیە. کە لەگەڵ ئەودا بیت –شادمانی- بەهرەیەکی مەزنە. ئێدی زۆر پێکەوە بووین‌و من گومانم لا نەما کە ئەو وەرگێڕە هێژایە، چی لە "زۆربای یۆنانی" کەمتر نییە، بە هەمان ئێش‌و ئازار، عەشق‌و شکۆمەندییەکانەوە.

خۆی دەڵێ: "من زۆربای ئێرانیم".

*

بەڵێ بەرلەوەی زمانی سووری ئەو پیرە، سەری سەوزی بدا بە باو پێش ئەوەی کە سیاوەش ئاسا تیغ بخەنە قوڕگیەوە، خۆی مەرگی تاقیکردەوە. پزیشکەکانی وڵات وتیان: شێرپەنجە!

قازی پرسی: کوێ؟

وتیان: شێرپەنجەی قوڕگ

قازی گوتی: دەرمان کەن!

وتیان: دەرمانکردن لە گۆڕێ نییە، لە پێدەکەوی.

قازی، پێکەنی‌و وتی خۆش بە حاڵی وڵاتێك كە پەککەوتەكانی وەکو قازین.

قازی بە هەوڵی دۆست‌و برادەرە زۆرەکانی خۆی، دەچێتە ئەڵمانیا، لە شاری ماربورگ پێشوازی لێدەکرێ‌و سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر لە نەخۆشخانەیەکی تایبەتی شێرپەنجەی قوڕگ دەخەوێنندرێ. پرۆفیسۆر (کلاین زاسر) سەردانی دەکات. هەڵسووڕێنەرانی نەخۆشخانەکە دەکەونە زۆر کاریگەریی ورەی بەرزی بورهێرد و نەخۆشەکانی تری دێننە لای، تا لە هەمبەر نائومێدی‌و خەمدانگرتندا ئیرادەی خۆیان بگۆڕن. قازی ئەنانەت ئومێدی ئومێدەوارانە.

بەر لە نەشتەرگەری پرۆفیسۆر کلاین زاسر بە قازی دەڵێ:

-دوای نەشتەرگەریی قوڕگت، ئیتر ناتوانی قسە بکەیت!

قازی پێدەکەنێ:

-لە وڵاتەکەی مندا قسەکردن قەدەغەیە.

قازی دوای نەشتەرگەرییەکە و بەێش شۆڕشی ئێران، دەگەڕێتەوە وڵات تا ئەرکی مەزن‌و مرۆڤدۆستانەی خۆی شێلگیرانە درێژە پێبدا. لەم وڵاتەدا کەم خوێنەر هەیە-کە ناوی "محەممەدی قازی" گۆشەیەکی لە یادەوەری‌و زەینیدا نەگرتبێ.

محەممەدی قازی هەمیشە لەنێو کۆمەڵی فراوانیی دۆست‌و لایەنگرەکانیدا نەك تەنها وەك وەرگێڕێکی مەزن‌و لێهاتوو، بەڵکو وەکو مرۆڤێکی شاعیر، عاشق‌و عەشق خوڵقێن مایەی ستایش‌و ڕێز بووەو هەروایش دەبێ، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە کۆمەڵی ئێمەدا، بە تایبەت کۆمەڵی خوێندەوار‌و ڕۆشنبیری ئێمەدا باوە کە ئەگەر هونەرمەندێکی بەرجەستەو ناسراو، دۆست‌و لایەنگرانی خۆی هەیە، بێگومان دەبێ کەسانێکی دژبەریشی

(جا ڕەوا یا ناڕەوا) ڕووبەڕوو ببنەوە، ناچار (محەممەدی قازی)یش دەبوا لەو بازنەیەدا بوایە، لە کاتێکدا وا نییە، محەممەدی قازی وەك حاڵەتێکی شاز تا ئێستا نەمبینیووەو نەمبیستووە کە کەسێك خراپ باسی کردبێ. لە بلاوکەرەوە پیرو لاوەکانەوە بگرە تا هەر چین‌و توێژێکی تری خاوەن قەڵەم، هەموو لایەك بێ دوودڵی دۆستدارو لایەنگری (قازی)ن.

محەممەدی قازی پۆلایەکی سەقادراوە وێڕای هاوخەمی کردن لەگەڵ ئەوانی تردا هەرگیز تووشی بێزاری‌و نائومێدی نەبووە. چالاك‌و گورج‌و گۆڵ، بە ڕادەیەك کەوا لە بەرامبەرەکەی دەکات ئەوە لەبیر بکات لەگەڵ کەسێکی نزیك بە هەفتا ساڵیدا قسەدەکات. ئەو جۆش‌و خرۆش‌و چالاکیەی ژیان لەم ساڵانەدا لە کەمتر هونەرمەندێکی لاو بەدی دەکرێ چ جای ئەوانەی کە چەند کراسێکیان زیاتر لە ئێمە دڕاندووە. قازی هەموو کێماسیەکانی ژیانی بێبایەخ گرتووە، لە کۆسپ‌و ناستەنگەکان تێپەڕیوەو وەکو غوولێکی جوان، بە تێشووی زۆرەوە هەنگاو دەنێ تا وەك نیچە دەڵێ، بگاتە دوندی بەرزترین ترۆپکی ئەو چیایەی کە کەس پێی نەگەیشتووە. جا بە ڕاستی جگە لە قازی مەزن کام وەرگێڕ هەیە کە هەنگاوی ئاوا گەورەی هەڵێنابێ؟ چونکە ئێستا هاوتاو هاوشانێك بۆ ئەو پیرە شك نابەین، ئایا دەتوانین ئومێدەوار بین کە لەنێو وەرگێڕانی نەوەی نوێ، کەسێکی وەکو ئەو سەرهەڵبدات؟

سەعید عەلی ساڵحی- تاران- ١٩٨٥

## ڕێزدار سالّحی خۆشەویست:

وا لەو پێشەکیە پڕ لە لوتفـو سۆزەی کە بۆ ناساندنی من بە خوێنەرانی خۆشەویست نووسیوتە، تێگەیشتم دیسان منتان بردۆتەوە ژێر میکرۆسکۆپی لوتفـو خۆشەویستی خۆتانو زۆر زیاتر لەوەی هەم بە گەورە نیشانت داوم. برا مەگەر من کێم کە شایستەی ئەو هەموو ڕێزو ستایشکردنە بم؟ وەرگێڕێکی سادە لە زمانی فەرەنسییەوە بۆ زمانی فارسی بە شێوازێکی تا ڕادەیەك گشت پەسەندو جووت لەگەڵ زەوقو سەلیقەی زۆربەی ڕۆشنبیرانو بە شێوەو شێوازی داڕشتنێك کە نیشان دەدا بە واتەی نووسەرو وەرگێڕی مەزن جەنابی (نەجەف دەریابەندەری) "لەنێو دەریای ئەدەبی کلاسیکی فارسیدا مەلەیەکم کردووەو ژێرئاوێکم لێداوە بێ ئەوەی تیایدا نقوم ببم".

ئەمە و، ئەگەر دەبینی قەبارەی کارو بەرهەمەکانیشم لەم سیو چەند ساڵەی کە بە کاری وەرگێڕانەوە خەریکم، لە ئەندازەی ئاسایی زیاتر بەدی دەکرێن ئەگەر بە بیرت بێت، لە هەڤپەیڤین لەگەڵ گۆڤاری "فەردای ئێران"یش باسم کردووە کە ئەمە خۆی بەڵگەی کارکردنی زۆری ناائاسایی من نییە، بەڵکو دەرخەری کەم کارکردنی ئەوانی ترەو ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کە من لەو ئەرکەی گرتوومەتە ئەستۆم ئەگەر کەمتەرخەمیم نەکردبێ مانگیشم دوولەت نەکردووە. من هەرگیز بانگەشەی ئەوە ناکەم کە وەرگێڕێکی گەورە بم، یا لەو لقەی هونەری وێژەدا بگەم بە مەزنە پیاوانی وەك دکتۆر (پەرویز ناتل خانلەری)و دکتۆر (ئەبولحەسەنی نەجەفی) و دکتۆر (مستەفا ڕەحیمی) و (نەجەف دەریابەندەری) و کەسانی تر، بەڵام

نکۆڵی لەوە ناکەم کە بە هۆی بوونی زەوق‌و سەلیقەی شیعری‌و بەکارهێنانی ئەو زەوق‌و سەلیقە شیعرییە لە کاری وەرگێڕاندا، لە وەرگێڕانی جوانکاریی ئەدەبی بیانی بۆ فارسی‌و لە هەڵبژاردنی دەستەواژەگەلی جوان‌و پڕ ئاهەنگی فارسی‌و تەریب لەگەڵ دەستەواژە بیانیەکانیاندا زەوق‌و سەلیقەیەکی تایبەت نیشان دەدەم کە ئەمە بۆتە مایەی ئەوەی کارو بەرهەمەکانم لەبەر دڵ‌و چاوی خوێنەرە خۆشەویستەکاندا هاوشانی لەگەڵ جوانکاریەکانی زمانی فارسی، شیرین‌و دڵنشین خۆ بنوێنن. ئەمە و، هەروەك ئێستا ئاماژەم پێدا لە زەوق‌و سەلیقەی شیعریش بەدەر نیم‌و لە بیرمە کە لە سەردەمی منداڵیمدا لەگەڵ کێش‌و سەراوی شیعریدا ئاشنا بووم‌و شیرینکاریەکانی شیعرم دەرك دەکرد. لەو بارەشەوە، هەرگیز بانگەشە ناکەم کە شاعیرێکی بەرجەستە بم، وەلێ لە ڕازو نهێنی‌و هونەرەکانی شیعری کلاسیکدا بێئاگا نیم‌و زۆر شیعرم هۆنیوەتەوە کە نموونەگەلێکیان لە کۆتایی ئەم هەڤپەیڤینەدا دێنمەوەو داوەریکردنیش سەبارەت باش‌و خراپیان بۆ خوێنەران لێدەگەڕێم. بەڵام دەزانم کە زۆرینەی خوێنەران‌و ئارەزوومەندانی وەرگێڕانەکانی من، ئەمن تەنها بە وەرگێڕ دەزانن‌و ئاگادار نین لەوەی کە جارجار شیعریش دەڵێم‌و لەو سەبکەی ئاخافتنەشدا دەردەدڵێك لەگەڵ خوێنەران دەکەم. هەرێ، ئەگەرچی زمانی دایکم‌و ئاخافتنی ڕۆژانەم کوردی بووەو جگە لەنێو پۆلی خوێندنی سەرەتایی لە مهابادو ئەویش لەسەر کتێبە دەرسیەکان دەنا هیچ سەروکارێکم بە زمانی فارسیەوە نەبووە لەگەڵ ئەوەشدا بە بیرمە لە پۆلی پێنجەم یا شەشەمی سەرەتایی بوو کە ئەودەم تەمەنم لە پازدە ساڵ زیاتر نەبوو، شیعرێکم سەبارەت بە جەڤاو چەرمەسەریی ڕۆژگار هۆنیبووەوەو ئێستا کە پەنجاو هەفت ساڵ تێدەپەڕێ تەنها هەرسێ بەیتی یەکەمیم وەبیر ماون. سێ

بەیت کە نیشان دەدەن لەو تەمەنە و لەو ڕەوشە کۆمەڵایەتیەی کە هەمبووە، زۆر نائاشنا نەبووم لەگەڵ زمانی فارسیدا. ئەمە سێ بەیتەکە:

(فەلەك وەکو گورگ بۆ کوشتنم ددانی چیڕ کردۆتەوە

پەنجە تیژەکانی بەهەر چوارلامدا دەوەشێنێ

وەك کەو کەوتوومەتە چەنگی بازێکەوە

کە لەبەر برسێتی مرۆڤ دەڕفێنێ

ئەگەرچی فەلەك کارو بەرخو گاو نەهەنگی هەیە

لێ لەبەر چاوچنۆکی خۆی جووجەڵەی بێگیان دەخوات).

بەهەرحاڵ، ڕێزو خۆشەویستیو سۆزی شاعیرانەی ئێوەی دۆستی هێژاو ڕێزدارم کە بە نووسینی پڕ لە جۆشو هەستی ڕاستگۆو شاعیرانەی خۆت، ئەو شیعرە زیندووەی شاعیری مەزن (سەعدی شیرازی)ت هێنامەوە یاد کە دەفەرموێ:

(کوا دوژمنی چاوشۆخی بێباك

تا کێماسیی من بخاتە بەرچاوم)

هەرچەندە ئەو شیعرە تەواو سەبارەت بە منو تۆ ڕاست نییە، چونکە نە من ڕەوشتێکی خراپم لە خۆم نیشان داوە کە شیاوی سەرزەشت بمو نە تۆش هەوڵت داوە کە ئەو (ڕەوشتە خراپە) "جوان بنوێنی". ئێوە تەنها پەسنی منتان کردووەو منتان بۆ ئەو شوێنە هەڵکێشاوە کە دەستم پێی ناگاتو ئەو بەرزکردنەوەیەش مەترسیەکەی ئەوەیە کە ئەگەر بکەوم دەستو قاچم دەشکێ.

لە گاڵتە بەدەر بێ، هەندێ جار سیو چەند ساڵ پێش ئەمڕۆم دێتە بیر کە تازە دەمەویست لەنێو وەرگێڕەکانی ئەوکات سەرێك هەڵکێشمو خۆشم

نیشان بدەم، بەڵام هیچ دەزگایەکی بڵاوکردنەوە قبوڵی نەدەکردمو ڕووی نەدەدامێ. ساڵی ١٩٥٠ بوو من دەستنووسە وەرگێڕدراوەکەی "دوورگەی پەنگوینەکان"م لە بن هەنگڵ بوو و لە شەقامی شاهئابادی ئەوکات کە شوێنی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە بوو دەرکە بە دەرکە بە دوای بڵاوکەرەوەیەکدا دەگەڕام کە بۆم چاپ بکات، بەڵام گشتیان دوای یەک دوو هەفتە کات گرتنو سەرگەرمکردن وەڵامی نیگەتیفیان دەدامەوەو نائومێدیان دەکردم. دڵم بۆ ئەو زەحمەتیەی کە لە ڕێی وەرگێڕانی ئەو شاکارە مەزنە کێشابووم، دەسووتاو ونەمدەزانی چی بکەم. ئەو پوزشەی کە دەزگاکانی بڵاوکەرەوە بۆ ڕەتکردنەوەی بەرهەمەکە دەیانهێنایەوە زیاتر بە هۆی ئاناتۆل فرانسو کەمتر لەبەر منەوە بوو، بەڵام چ دەکرێ کە پێوانەکە لەسەر بنەمای پارە بێت نەك شتێکی ترو بە ڕاستی ڕووبەڕووی ڕەوشێکی ناخۆش بووبوومەوە. دەیانگوت: ئاناتۆل فرانس نووسەرێکە کە ئەمڕۆ بازاڕی نییە و هیچ خوێنەرێکیش تۆ ناناسی کە لانی کەم لەبەر ناوی تۆ کتێبەکە بکڕێ. بە ڕێکەوت من ساڵی ١٩٣٩ یانی ١١ ساڵ پێشتر، ئەو کاتەی کە دوای وەرگرتنی لیسانسی ماف و بۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەربازی دەچوومە زانستگەی ئەفسەری، لەبەرئەوەی پارەی پێویستم بۆ کڕینی پێداویستیەکانی چوونە زانستگە نەبوو ئەو کڕینانەش پەنجا تومانی ئەودەمی گەرەك بوو، کتێبی "کلودی وێڵگەرد"ی (ڤیکتۆر هۆگۆ)م بۆ دەزگای بڵاوکردنەوەی (ئەفشاری) وەرگێڕاو شەست تۆمانم وەدەست هێنابوو، جا من ئەو پێشینەیەی خۆم بۆ بڵاوکەرەوە بەڕێزەکان باس دەکرد، بەڵام ئەو پێشینەیە بۆ ئەوان چووبووە خانەی تێپەڕبوونی زەمەنو ئەوەیان بۆ پەسەندکردنی ناوی من بەس نەدەبینی. سەرەنجام دوای دوو ساڵو هەندێك ڕاکەڕاك کە هەرگیز وازم

نەهێناو هەردەم لەبەردەم بڵاوکەرەوەکان قووت دەبوومەوەو باشی‌و شیرینکاریەکانی کتێبەکەم بۆ باس دەکردن، دەزگای چاپەمەنی (سەفیعەلیشا) لە شەقامی (بەهارستان) بە سێ مەرج ئامادە بوو کتێبەکەم بۆ چاپ بکات: یەکەم بەر لە چاپکردنی کتێبی (دوورگەی پەنگوینیەکان) کتێبێکی تری نووسەرێکی بازاڕ پەسەند کە دەزگای ناوبراویش پەسندی بکات وەربگێڕم‌و بۆیان ببەم. دووەم لە بەرامبەر وەرگێڕانی کتێبەکە داوای پارە نەکەم تەنها پەنجا دانە لە کتێبەکە وەربگرم‌و بەس‌و سێیەمیش یەکێ لە زانستمەندانی ئەوکات پێشەکیەك بۆ کتێبی (دوورگەی پەنگوینەکان) بنووسێ کە لانی کەم بە پاڵپشتی پێشەکی ئەو مامۆستایە بتوانن ئومێدەوار بن کە کتێبەکە بفرۆشرێ. چونکە بڕیارم دابوو بەهەر نرخێك بێت ئەو بەربەستە بشکێنم‌و ئەو کۆسپە لەبەرپێی خۆم لادەم هەرسێ مەرجەکەم قبوڵ کرد. بۆ جێبەجێکردنی مەرجی یەکەم کتێبی "دان چەرموو"ی (جەك لەندەن)م پێناساندن کە هێشتا وەرنەگێڕدرابووە سەر زمانی فارسی‌و دەزگاکە ناوی ئەو کتێبەی نەبیستبوو. ئەوەی قبوڵ بوو کە جەك لەندەن نووسەرێکی بازاڕ پەسندە، بەڵام گومانی هەبوو کە کتێبێکی بەو ناوەی هەبێ. بە ناچاری گەڕایەوە بۆ کتێبێکی وەرگێڕدراوی جەك لەندەن لە لایەن (فەرامەرزی بەرزگەر) کە ئەوکات وەرگێڕێکی ناسراو بوو تا ببینێ داخۆ وەرگێڕ وێڕای ئاماژەکردن بە کارەکانی تری نووسەر ناوی ئەم کتێبەشی هێناوە یان نا، لە پڕ هاواری کرد:

-ئەی بەرێزا مەبەستی تۆ لە "دان چەرموو" چەرموودانە کە لێرەدا ناوی هاتووە؟ تۆ چما ناوی کتێبەکەت ئاوەژوو کردۆتەوە؟ پێکەنیم‌و گوتم جەنابی وەرگێڕ هەڵەی فەرمووە نەك من، "دان چەرموو" ناوی سەگێکە کە قارەمانی

ئەم کتێبەیەو "چەرمووردان" ناشێ ناوی تایبەت بێ. تکایە هەڵەکە لە کتێبەکەی لای خۆتان ڕاست بکەنەوە.

ئیدی لەوە بەدواوە ئەوان بە چاوێکی تر سەیریان دەکردم، بەڵام جەختیان لەسەر هەرسێ مەرجەکە کردەوەو منیش ڕازیبوونی خۆم بۆ دووپات کردنەوە.

گەڕامەوە ماڵو دەستم بە وەرگێڕانی کتێبی "دان چەرموو" کرد.

دوو هەفتە دواتر ئەو سێ بەشەی کە وەرم گێڕابوو پاکنووسم کردو بۆیانم بردو دەزگاکەش نیشانی سەرۆکی دەزگا یانی ڕێزدار (موشەفەقی هەمەدانی) دا کە خۆیشی وەرگێڕ بوو. ناوبراو دانی پیانا کە وەرگێڕانەکە لە ئاستێکی بەرزدایە و داوایان کرد کە درێژە بە کارەکە بدەم. وەرگێڕانی کتێبی "دان چەرموو" لە ماوەی سێ مانگدا کۆتایی هاتو چاپکراو بە پێی مەرجی دووەم تەنها پەنجا دانەیان دایە من کە زۆربەیانم بەسەر دۆستو هاوڕێکانمدا دابەش کرد. پێشوازی بێوێنەی خوێنەران لە "دان چەرموو"، چاپی "دوورگەی پەنگوینەکان"ی هێنایە پێش. منیش لە ماوەی ئەو چەند مانگەی نێوان وەرگێڕانو چاپکردنی "دان چەرموو" و دەستپێکردنی چاپی "دوورگەی پەنگوینەکان" توانیم بە هۆی بەڕێز (ئەحمەد سادق) وەرگێڕانی "دوورگەی پەنگوینەکان" نیشانی خوالێخۆشبوو مامۆستا (سەعیدی نەفیسی) بدەمو داوای نووسینی پێشەکیەکی لێبکەم بۆ ئەو کتێبە. (نەفیسی)ی مەزن پێدەچوو بواری خوێندنەوەی کتێبەکەی نەبووبێو من ئەمەم لەو پێشەکیەی کە بۆ کتێبەکە نووسیبووی دەرك کرد. مامۆستا لەو پێشەکیەی کە لە چاپی یەکەمی ڕێکەوتی ٩ی ئازاری ساڵی ١٩٥٢دا هاتووە، ئاوا دەنووسێ:

".. یەکێ لەو ڕازاندنەوەو دەربڕینە کلاسیکیانە بریتیە لە دەرخستنی ڕاستیەکان لە زمانی گیانداران‌و هەندێ جاریش لە زمانی گیاوگوڵ‌و بوونەوەرە بێگیانەکان. (فابلەکانی ئوزۆپی یۆنانی) و چیرۆکەکانی (کەلیلەو دەمنە) یا (پەنجەی تەنتەرە) بە زمانی سانسکریت کە (هیتوپارسە) چرکردنەوەیەکە لەوەو کۆنترین یادگاری ئەدەبییە لە جیهاندا..". بێگومان هەمووومان دەزانین کە لە دوورگەی پەنگۆپینەکاندا وەك کەلیلەو دەمنەو پەنجەی تەنتەرە قسە لە زمانی گیاندارانەوە نەکراوە، بەڵام چونکە پێشەکی مامۆستا مەرجی سێیەمی چاپکردنی کتێبەکە بوو ناچار قبوڵمان کرد کە بە هەمان پێشەکی چاپ بکرێ‌و هەڵبەتە لە چاپەکانی دواتری کتێبەدا هەڵمانگرت.

بەڵێ، من بەم چەشنە ڕێی خۆم کردەوە وا دوای سی‌و چەند ساڵێك دەبینی بوومەتە ئەو محەمەدی قازیەی کە هەنووکە تا ڕادەیەك چاوگ‌و ڕیچکەیەکی وەرگێڕانم‌و (ساڵحی) هێژا بە لوتف‌و خۆشەویستی بێپایانی خۆی لە پێشەکی ئەم هەڵپەیڤینەدا دەنووسێ:

".. و بە ڕاستی دوای قازی گەورە وەرگێڕ کامە وەرگێڕ شك دەبەین کە هەنگاوی وا مەزنی نابێ؟ و لەبەرئەوەی ئێستا هاوشانێك بۆ ئەو پیرە نابینین ئایا دەتوانین ئومێدەوار بین کە لەنێو وەرگێڕەکانی نەوەی نوێ کەسێکی وەك ئەو سەرهەڵبدات؟".

بەڵێ ساڵحی هێژا، سەرهەڵدەداو دەبێ سەرهەڵبدات، بۆ، چونکە هیچ کەس لە هیچ شتدا کۆتاییهێنەر نییە. مەگەر بە شێوەیەکی شازو چاوەڕوان نەکراو، کە بێگومان (حافز) یەکێك لەو شازانەیە، چونکە جارێکی تر ئەو هەلومەرج‌و کات‌و شوێنەی سەردەمی حافز بۆ کەسێکی تر دووبارە نابێتەوە،

بەلام بۆ وەرگێڕان هێشتا مەیدانەکە فراوانەو ڕێگایەکی زۆر ماوە تا کەسێك لەو ڕێڕەوەدا بە ترۆپکی شازبوون بگات.

مەبەستم لە باسکردنی ئەو هەوڵو تێکۆشانە بۆ گەیشتن بە ئامانجو مەبەست ئەوە بوو کە بڵێم مرۆڤ بە خۆڕاگری‌و پێداگری بۆ گەیشتن بە ئامانج سەرەنجام دەتوانێ پێی بگات‌و کە خۆشت یەکێك لەو نموونانەی. مەگەر لە بیرت کردووە کە لە سەرەتای کارکردنتدا دەتویست ڕۆمانەکەی خۆت چاپ بکەیت، تووشی گیروگرفت‌و کۆسپ بوویتەوە؟ مەگەر بۆ چاپکردنی ڕۆمانی جوانی "سەمای ڕەنج" دواجار ناچار نەبوویت پێشەکیەك لە محەممەدی قازی وەربگریت‌و دەزگای بڵاوکردنەوە لەسەر بەرگی کتێبەکەت بنووسێ: "لەگەڵ پێشەکیەك لە محەممەدی قازیەوە"، بەلام کاتێ کە ناسرایت‌و خەڵك ئاشنای ناوەکەت گەرچی لەژێر ناوی خوازراوی "خەسرەوی نەسیمی" بوو، ئیدی بۆ چاپکردنی بەرهەمی دواترتان کە لەژێر ناوی "یاخە چرکاویەکان" بڵاوت کردەوە، پێویستیت بە پێشەکی محەممەدی قازی هەبوو؟ نەخێر. بە جۆرێك کە ئەمڕۆ هەمووان تۆ وەکو یەکێ لە نووسەرە سەرکەوتوو و جواننووس‌و یەکێ لە شاعیرە پێشڕەوەکان بە چاکی دەناسن‌و کە ئەمە هێشتا سەرەتای کارو ببینە کاتێ دەگەیتە تەمەن‌و پێشینەو ئەزموونی من، چۆن دەبیت! بە دڵنیاییەوە پایەو ئاستێکی زۆر بەرزترو مەزنتر لە من‌و نموونەکانی وەك من وەدەست دێنی، چونکە گوێزەرەوەی هزری ئەوانی تر نیت بەڵکو خۆت داهێنەری‌و خاوەنی هزری خۆتی، و ئەمە بێگومان نرخ‌و بەهایەکی زۆر زیاتر لە وەرگێڕانی هەیە.

زستانی ساڵی ١٩٨٥

محەممەدی قازی

## هەڤپەیڤین:
-محەمەدی قازی
-سەید عەلی سالحی

پ: ئەگەر بۆ هەمووانیش نا، بەڵام بۆ زۆرانێك ڕەنگە دابڕان و خۆدوورخستنەوەی بیرای برِ لە هەندێ دڵبەستەگی یا تایبەتمەندیەکانی سەردەمی منداڵی شتێکی نامەیسەر بێت، هەندێ جار دەبینین کە هەستو هزرمان لەژێر کاریگەریی کردارگەلێکی جیاجیا، بۆ نموونە: کاریگەری بۆن، تام، سەیرکردن، دەستلێدان، غەم، شادمانی، ئاوازو ئاهەنگ، کاردانەوەیەکی منداڵانەی هاوکات لەگەڵ بیرەوەریەکی هەمان ڕۆژگاری منداڵی نیشان دەدات، و بوونی ئەو هەستەی کە هەمیشە وا دەزانین "منداڵێتی" لە گۆشەیەکی گیانی مرۆڤدا جێیگرتووە، بێگومان لە ڕوانگەی هەندێ لە دەروونناسان، جۆرێك وابەستەیی بە دایكو زادگایە، کە ئەو وابەستەبوونە بە -پێنەگەیشتنی گەشەی کۆمەڵایەتی- لێکدەدەنەوە. بەڵام تاقیکردنەوە نیشانی داوە کە ئەو لێکدانەوەیە ڕاست نییە. ئەو مرۆڤە پێگەیشتوو، داهێنەرو چارەنووسسازەی ئەمرۆ، هەمان منداڵەکەی دوێنێیە، بەو جیاوازییەی کە هاوشان لەگەڵ گەشەی فیزیکی، عەقڵ، بوون، ویژدان، دیدو خوێندەواری وەدەست خستووە، پەرەی پێداوەو دەوڵەمەندی کردووە. لێرەدا پرسەکە لەسەر گەشەو پێگەیشتنە. هەڵسان و جیهان لە بەرزاییەکی

ترمەوە دیتنەو هەمموو ئەو قۆناغە بچوکانە زادەی هەمان قۆناغو سەردەمی منداڵیە، قۆناغێك کە کەسایەتیی مرۆڤەکانی تیادا بەرجەستە دەبێ، پێدەگا، تا بەرەو ئاسمان سەرهەڵبڕێتەوە..

بەڵێ بەم کورتەیە وەك لە دەرکەدانێك، پرسیارەکەم دەخەمە ڕوو. بەڕێز قازی! بە داوای لێبووردنەوە درێژەی ئاخفتنەکە بە تۆ دەسپێرم. لە منداڵێتیتان قسە بکە. لە زادگا، لە ناوچەکەت، لەو ڕۆژگارەو ئەو بیرەوەریانەی کە هەتن.

و: لە خودی قسەکانت وا تێگەیشتم کە قۆناغی شیرینی منداڵی قۆناغی گەشەی پلە بە پلەی دەرك‌و هێزو تواناو شکۆمەندیەکانی ئادەمیزادەو ئەو پەیوەندیەی کە مرۆڤەکان لە قۆناغی پیریشدا یادگاری ئەو قۆناغە خۆشانە لە هزریاندا دەپارێزن نەك تەنها نابێ بە پێنەگەیشتنی گەشەی کۆمەلایەتی لێکبدرێتەوە بەڵکو دەبێ بە نیشانەیەکی بزانن بۆ مکومبوونی ڕشتەی تەمەن کە لە هیچ قۆناغێکدا نەپچڕاوەو بە هەمان سەقامگیری‌و مکومبوونیەوە دەستپێك‌و ئەنجامی ژیان پێکەوە دەبەستێتەوە.

من خۆشم کەوا بەو هەمموو جۆش‌و خرۆش‌و چالاکیەی خۆت ئاگاداری لە ژیاندا هەممەو پێم ناوەتە تەمەنی هەفتاو دوو ساڵی، زۆر جاران لە کۆڕو دانیشتنی دۆستانەدا سەرنجی هاوڕێیانی لە خۆم لاوتر بۆ لای خۆم ڕادەکێشم، هەمووان بە سەرسامیەوە لێم دەپرسن ئایا هیچ هەست بە لاوێتی دەکەم؟ کاتێك وەڵامی من نێگەتیڤە بە ناباوەڕیەوە دەڵێن ڕێی تێناچێ ئێوە بەو هەمموو شۆڕو شەوق‌و چالاکیەتان هەستی لاوێتی نەکەن، بێگومان ئەمە سادەیی نواندنێکە دەیکەیت. پێیاندەڵێم نە بە خوا، سادەیی نواندن نییەو بەڵام هەستی لاوبوونیش ناکەم بەڵکو زیاتر هەستی منداڵێتی

دەکەم. ئینجا هەموویان پێدەکەنن‌و مەبەستی من تێدەگەن‌و دانی پێدادەنێن کە بەو جۆش‌و خرۆش‌و ورمەیەی کە هەمە، سەیر نییە گەر هەستی منداڵێتی لە خۆمدا بکەم.

ئەرێ، ساڵحی خۆشەویست، من لە سەردەمی منداڵیمدا بیرەوەریگەلێکی خۆش‌و ناخۆشم هەن کە تێکەڵەی ئەو بیرەوەریە خۆش‌و ناخۆشانە پێکەوە تابلۆیەکی زیندووی ژیانن، چونکە بە ڕاستی ژیانیش ئاوێتەیەکە لە خۆشی‌و غەم‌و حەسرەتەکان‌و بە هەموو ئەمانەوە شیرین‌و مایەی داخوازیە.

چەند ساڵ بەر لە ئێستا دەستم کرد بە نووسینی کتێبێك لەژێر ناوی "بیرەوەریەکانی وەرگێڕێك" کە یەکەم جار بە تەما بووم کورتە مێژوویێکی هەوڵ‌و تێکۆشانەکانم بێت لە ڕێی گەیشتنم بەو وەرگێڕەی ئەمڕۆ، بەڵام دواتر کردمە نووسینێك کە هەموو قۆناغەکانی ژیانم لەخۆ بگرێ‌و ئێستا گەیاندوومەتە ڕووداوەکانی ژیانی خۆم تا ساڵی ١٩٦٣.

لە ساڵی ١٩٧٧ کە لە مەڵبەندی پەروەردەی هزریی منداڵان‌و مێرمنداڵان وەکو وەرگێڕو ئەدیتور کارم دەکرد، مەڵبەندی ناوبراو کارنامەیەکی مانگانەی بڵاو دەکردەوەو داوای لە من کرد تا مانگانە بەشێك لەو کتێبەیان بۆ چاپکردن لە کارنامەکە بدەمێ، من ئەمەم قبوڵ کردو لە دەستپێکی ژیانمەوە دەستم بە چاپکردنی بیرەوەریەکانم لەو گۆڤارەدا کرد. دیمەنەکان بۆ خوێنەران هێندە سەرنجڕاکێش‌و مایەی پەسەندبوون کە تیراژی گۆڤارەکەی یەکسەر لە دوو هەزار دانە گەیاندە دە هەزار دانە و زۆرێك لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوکات دەستیان بە گواستنەوەو بڵاوکردنەوەی دیمەنەکانی کرد. بە ڕێکەوت هەموو ئەو گواستنەوانە بێ مۆڵەت ئەنجام

دەدران‌و من چونکە لەسەر داوای مەڵبەندەکەی خۆمان نارەزایەتیم دەردەبڕی ئەوان ناچار بە دانی (ماف زەحمەتەکانم) زمانیان دەگرتم. بە داخەوە چاپکردنی ئەو بیرەوەریانە لەبەر چەند هۆیەك مەیسەر نییەو لابردنی هەندێ لە بابەتەکانیشی لە بایەخ‌و جوانی بەرهەمەکە کەم دەکاتەوە، بەڵام دەتوانم چەند بەشێکی بچووکی کە پەیوەندیی بە سەردەمی منداڵیمەوە هەیە و مایەی مەبەستی بەڕێزتانە، بە کورتی لێرەدا باس بکەم:

"..خوا لێخۆشبووی باوکم، میرزا عەبدولخالقی قازی کە عەمامە بەسەرو ئیمام‌و خەتیبی شاری مهاباد بوو، لەگەڵ کچێکی خزمی خۆی بە ناوی ئامینە خانم زەماوەند دەکات. بووك پازدە ساڵ لە زاوا بچوکترەو لە جوانیش بێ بەهرە نییە. ئیمام زۆر ئارەزوومەندە کە کوڕێکی بە ناوی (محەمەد)ی هەبێ بەردەوام ژنەکەی هان دەدا کە کوڕێکی بۆ بێنێتە دنیا. ئەو مرازە دێتە دی‌و نۆبووك دوای ساڵ‌و شتێك کوڕێك بۆ مامۆستا دێنێتە دنیا کە ناوی دەنێن (محەمەد). دەتوانی هەستی پێبکەیت کە شۆڕو شەوقی مامۆستاو هاوسەرەکەی سەبارەت بەو کامەرانیە تاچ ڕادەیەکە. بەڵام لەبەرئەوەی چەرخی چەپگەرد هەرگیز ناهێڵێ شۆڕو شەوق‌و شادمانی ئادەمیزاد بەردەوام بێت، زارۆ لە هەمان ساڵی یەکەمی لەدایکبوونیدا بە هۆی نەخۆشییێکی منداڵانە کە نازانم خوریکە بووە یا سوورێژە دەمرێ‌و مامۆستاو ئامینەخانم تازیەبار دەکا. غەم‌و کەسەری دایك‌و باوك لەو کۆستە لە باسکردن نایەو وێڕای دڵدانەوەی خزمە نزیك‌و دوورەکان‌و ئاشناو دراوسێکان تا دووبارە سکپڕبوونەوەی ئامینەخانم، درێژە دەکێشێ. هەمووان دەستەو نزان کە ئەمجارە خانم کوڕی بێ‌و بێسەبرانە لە

چاوەڕوانیدا نۆ مانگو نۆ ڕۆژەو نۆ کاتژمێر دەژمێرن. ئیمام نزاکانی خۆیو هاوسەرەکەی گیرا دەبینێو زارۆی دووەمیش کوڕ دەردەچێ. مامۆستا لەگەڵ نارەزایی دایکی منداڵەکە، ناوی ئەمەشیان دەکاتە (محەمەد) و هەرچەندە بێچارە دایك دادو نزولە دەکا کە ناوی محەمەد لە منداڵی یەکەم نەکەوتو لەمەشیان ناکەوێ، کەچی ئیمام هەردوو پێی دەخاتە پێلاوێك کە یا دەبێ ناوی کوڕەکەی محەمەد بێ یا هیچ. بەستەزمان دایك بە ناچاری ملدەداو ڕازی دەبێ کە ناوی ئەمەشیان محەمەد بێت، بەڵام لە ناخەوە زۆر نیگەرانە. هەمیشە ئەوەی کە مرۆڤ لێی دەترسێ دەڵێن تووشی دەبێ. ئەم منداڵەش دوو سێ مانگ دوای لەدایکبوونی دەمرێو ماڵەکە دەخاتە نێو پرسەوە. ئاشکرایە کە سەرزەنشتو گازاندەی دایکەکە سەبارەت بە پێداگریو تەریقبوونەوەی باوك کە گوێی بە قسەکانی دایکی منداڵەکە نەداوە تا چ ڕادەیەکە. خەمو خەفەتی ماڵباتەکە بە ئەندازەیەکە کە ئیدی ئارەزووی بوونی منداڵیان نامێنێ، تەنانەت دوای ماوەیەك کاتێ پێدەزانن کە ئامینە خانم بۆ جاری سێیەم سکی هەیە، شادیو خۆشیەك لە خۆیاندا نیشان نادەن.

"ماوەی دیاریکراو بێ هیچ شادیو چاوەڕوانییەك تێدەپەڕێ، بە تایبەت بایەخنەدان بەو ڕووداوە کاتێك دەگاتە ئەوپەری کە تێدەگەن، زارۆ کچە نەك کوڕ. ناوی دەنێن (خەدیجە) و بە تەمای خوای لێدەگەڕێن. خەدیجە لە دوو برا ناکامەکەی خۆی دوو سێ مانگێك زیاتر دەژی، بەڵام دواجار ئەویش بەرگەی دووری ئەوان ناگرێو بە هۆی نەخۆشییەکی کوشندە پەیوەست دەبێ پێیانەوە.

"هیچ کەس نازانێ ئەو بەڵایە چییە بەرۆکی ماڵی مەلای گرتووەو بۆچی منداڵەکانی یەك دوای ئەوی دی دەمرن. ئیدی نە ئارەزوویێك بۆ بوونی منداڵ هەیە و نە سەرو دڵی ئارەزووکردن، وەلێ چما سروشت لەو بارەیەوە گوێ دەداتە خواستو چاوەڕوانی یا بێزاری کەسێك؟ ئامینەخانم بۆ جاری چوارەم سکی دەبێتەوەو بە ڕواڵەت بە خوێنساردییەوە پێشوازی لەو ڕووداوە دەکەن. ئیمام لە ناخەوە زۆر خۆشحاڵەو زۆر ئارەزوومەندە کە ئەمەیان کوڕ بێت، و هێشتا ئارەزووی هەبوونی کوڕێکی بە ناوی محەممەدی لەدەست نەداوە، بەڵام بەسەر خۆیدا ناهێنێو شادمانیو هەستی ناخی خۆی دەرناخات. منداڵبوونەکە سەرکەوتووانە تەواو دەبێو مامۆستا دەبێتە باوکی کوڕێك کە دیسان ناوی دەنێ "محەممەد". ناڕەزایەتی دایكو کەسوکار ئەنجامی نابێو ئیمام پێیان دەڵێت خەوم بینیوەو لە خەودا مژدەیان پێداوم کە کوڕەکەم زیندوو دەمێنێتەوە. ئێستا جەنابی مامۆستا ئەگەرچی ناوی خۆی (عەبدوڵڵا) نەبووە (عەبدولخالق) بووە ئەو هەموو پێداگرییەی لە چی بووە کە خۆشی بێ ترشی بێ ئامینە خانمی هاوسەری دەبێ کوڕێکی بە ناوی محەممەدی هەبێ، ئەمەیان بۆ ئێمە دیار نییە. دوای ئەم کوڕەش کچێکی تریان بوو بە ناوی (سوغرا)، بەڵام لەو کاتەی کە محەممەدی سێیەم پێنج شەش ساڵە بووە ئەمجارە بەدشگونی ناوی کوڕەکە دامەنگیری خودی باوك بووەوەو ماڵاوایی لە ژیان کردو ئامینە خانمی بە دوو منداڵەوە کردە بێوەژنو ڕۆیشت.

"بەڵێ ئەی ساڵحی بەڕێزو خۆشەویست، ئەو (محەممەد)ەی سێیەم ئەوە خودی بەندەیە کەوا دوای هەفتاو دوو ساڵ هێشتا هەر زیندووەو بە تەماش نیم بەم زووانە بمرم. بەڵکو قسەکەی ئیمام کە گوتبووی لە خەودا

مژدەیان پێداوم کوڕەکەم زیندوو دەمێنێتەوە ڕاست دەربچێت، کێ دەزانێ.
بەهەرحاڵ ئەگەر باوکی من لە جیاتی ئیمامو پێشنوێژیکەری شاری مهاباد سوڵتانی عوسمانی یا لانی کەم ئیمامی یەمەن بووایە، ئێستا من لە جێی محەمەدی قازیی وەرگێڕ، کە جگە لە ئێوەو چەند ڕۆشنبیرێکی کتێبخوێن کەسێکی تر نایناسێ، سوڵتان محەممەدی سێیەم یا ئیمام محەممەدی سێیەم دەبووم‌و بۆ خۆم دام‌و دەزگاو بێنەو بەردەیەکی زۆرم دەبوو..

"با لەوانە بگەڕێین، من ڕووداوی مردنی باوکمم لەبیر نییە، هەر ئەوەندەم لە بیرە کە دوای مردنی ئەو یەك دوو ساڵێك لەژێر سەرپەرشتی دایکم‌و نەنکم (دایکی باوکم) لە گوندی (سرێلاوا) کە گوندێکی سەر بە مهابادە، ژیانمان بردە سەر تا دایکی هێشتا جاحێڵمان شووی بە یەکێ لە بەگزادەکانی فەیزوڵڵا بەگی بە ناوی (مەحمود بەگ)ی چاغەرلو، کردو من‌و خوشکەکەمی بە کەزی‌و بسکی نەنکمەوە بەست‌و خۆی لێیدا ڕۆیشت. دیمەنی بردنی دایکم لە گوندی سرێلاوا بۆ چاغەرلو باش بە بیرە کە بە کەژاوە بردیان. خوشکەکەم لەوە بچوکتر بوو کە شتێك لە ڕووداوەکە تێبگا، بەڵام من تێگەیشتم لەمە بەدواوە بێ دایك دەبین، هەرکە کەژاوەی بووك‌و سوارانی لەگەڵیدا بوون پێنج سەد هەنگاوێك لە گوند دوورکەوتنەوە، منیان لەو ژوورە ئازاد کرد کە تیایدا بەند کرابووم تا شیوەن‌و گریان نەنێمەوە. یەکسەر بە ڕاکردن کەوتمە دوای کەژاوەکەو دەستم کرد بە ناڵەو گریان. زۆری نەمابوو کە پێیان بگەمەوە، بەڵام دڕکێکی گەورەم لە قاچی ڕاچوو نەمتوانی چیتر بڕۆم، بە گریانەوە دانیشتم تا دڕکەکە لە پێم دەربێنم، کاروانی بووك گواستنەوەکە ئەوەندە دوور کەوتبووەوە کە ئیدی ئومێدی گەیشتن پێی نەمابوو. ناچار بە شەلەشەل گەڕامەوە دێ..

"هەڵبەتە، دواتر کە تەمەنم گەیشتبووە دە دوازدە ساڵی چوومە گوندەکەی دایکم‌و ماوەیەك لەلای مامەوە. خوالێخۆشبوو مەحمود بەگی زڕباوکم کە ئەودەم دوو کوڕی لە دایکم هەبوون بە ناوی (ئەحمەد خان) و (ڕەشید خان) زۆر خۆشەویستی لە ئاست مندا دەنواندو منی دەنارده مەکتەبی گوند کە لە لای (شێخ عزەددین) فێری قورئان ببم. زۆری پێنەچوو کە بە فەرمانی (قازی عەلی)، گەورەی بنەماڵەی قازیەکان‌و باوکی (قازی محەمەد)ی ناسراو، منیان ناردە (سابلاغ)ی موکریان (مهابادی ئێستا)و چوومە خوێندنگەی سەرەتایی. ساڵی ١٩٢٧ بڕوانامەی شەشەمی سەرەتاییم وەرگرت، لەبەرئەوەی ئەوکات مهاباد خوێندنگەی ناوەندی لێنەبوو، ساڵێکی تەمەنم بێهوودە لەدەست چوو. لە هاوینی ساڵی ١٩٢٩ بەختم گرتی‌و مامی خوالێخۆشبووم دکتۆر (جەوادی قازی) کە لە سەردەمی وەزارەتی داد وەك دادوەر لە ئەڵمانیاوە بۆ تاران‌و بۆ وەزارەتی ناوبراو گواسترابووەوە، داوای کرد بچمە تاران‌و لەوێ ناردمیەوە خوێندنگە.

ساڵی ١٩٣٥ لە دواناوەندی خانەی هونەرەکانی تاران بڕوانامەی دیپلۆمی ئەدەبیم وەرگرت‌و هەرچەندە حەزم لە خوێندنی بەشی ئەدەبیات بوو، بەڵام بە هاندان‌و فەرمانی مامم چوومە کۆلێژی ماف. ساڵی ١٩٣٩ توانیم زانستنامەی لیسانس لە ڕشتەی دادوەری وەربگرم‌و ساڵەکانی ١٩٤٠ و ١٩٤١ بچمە ئەنجامدانی خزمەتی سەربازی. تەنها مانگێك مابوو کە خزمەتی سەربازیم کۆتایی بێت کە ڕووداوی (شەهریوەر)ی ساڵی ١٩٤١ ڕوویداو هێزی (هاوپەیمانان) لە باشوورو باکوورەوە ئێرانیان داگیر کرد. چونکە حەزم لە کاری پارێزەری‌و دادوەری نەبوو، لە وەزارەتی دارایی دامەزرام‌و هەروەك لە پێشەکیشدا باسم کرد گەرچی لە ساڵی ١٩٣٩دا بە وەرگێڕانی (کلودی

وێلگەرد)ی (ڤیکتۆر هۆگۆ) و سیناریوی (دۆن کیشۆت) و نوسینێکی خۆم بە ناوی "زارا" دەستم بە کاری وەرگێڕان کردبوو، بەڵام ماوەیەك دواکەوت تا لە ساڵی ١٩٥٠ بە وەرگێڕانی کتێبی جوانی (دوورگەی پەنگۆیینەکان)ی (ئەناتول فرانس) دووبارە ڕووم کردەوە کاری مایەی ئارەزووی خۆمو لەوساوە تا ئێستا پتر لە پەنجا ناونیشانی باش‌و بەنرخم لە ڕووی ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی‌و ڕێنوێنیکردنەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی کە زۆربەی هەرە زۆریان چەندین جار چاپ کراونەتەوە. هیوادارم بتوانم لانی کەم تا دە ساڵی تریش درێژە بەو کارە دڵخوازو گرنگەی خۆم بدەمو تا دەتوانم درێژە بەو خزمەتە بدەم کە بە بڕوای خۆم بۆ کلتورو ئەدەبی وڵاتەکەم ئەنجامی دەدەم. داوات کردبوو بیرەوەرییێکت لە سەردەمی منداڵی خۆمەوە بۆ بنووسم وا لە خوارەوە یەکێك لەو بیرەوەریانەی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە کە ناخۆش نییە و تا کەمێکیش پێبکەنی‌و شەکەتیت دەرکەیت.

خۆت دەزانی کە ئێمەی کورد (سوننی) مەزهەبین‌و پەیڕەوی ڕێڕەوی (شافیعی). کاتی لە مهابادەوە بۆ درێژەدان بە خوێندن هاتمە لای مام لە تاران‌و لە خانەی هونەرەکاندا ناوی خۆم نووسی، منداڵانی هاوپۆلم هەر زوو زانیان کە من (سوننی)م، و لەبەرئەوەی ئەوان (شیعە) بوون لە کاتەکانی پشوودانەدا سەریان دەخستە سەرم‌و جنێوی دنیایان دەدایە (عومەری کوڕی خەتتاب). منی دەمارگیر کە بە تەنێ لەنێو ئەواندا گیرم کردبوو بەرگەی ئەو سووکایەتیانەم نەدەگرت‌و هەمیشە دەبووە شەڕم لەگەڵیاندا، بەڵام منداڵانی عاقڵتریش هەبوون کە ئێمەیان لێکدەکردەوەو ئامۆژگاری ئەو منداڵە هاروهاج‌و بێئەدەبانەیان دەکرد کە چیتر نەمئێشێنن. یەکێك لەوان کوڕێکی باڵابەرز بوو بە ناوی (زولەجدەین) کە

پێدەچوو چێژێکی زۆر سەیر لە ئازاردانی من وەربگرێ. هەرکە زەنگی پشوودان لێدەدرا لە بەردەمم قووت دەبووەوەو پێشی پێدەگرتم‌و دەستی پێدەکرد: "عومەر عومەرۆ.. باوك سەگۆ.." یا "عومەر نەبوو بەڵا بوو، بەردی دەرگەی..". چەندین جار دانم بە خۆمدا گرت‌و تەنها هەر بە جنێودان وەڵامم دایەوە، بەڵام کوڕە دەستەهەڵگر نەبوو و لەم دواییانەدا دوو سێ کەسی تریشی بە دوای خۆ دەداو پێکەوە سەوداسەرم دەبوون.

ڕۆژێك کە ئیدی کاسەی سەبرم پڕببوو هەر زولەجدەهین ئاوازە ناپەسەندەکەی خۆی هەڵدا، درێغیم نەکردو مستێکی وا توندم خێواندە نێودەمی کە گوایە دوو ددانیم شکاندبوو و بە دەم‌و لووتی پڕ لە خوێن یەکڕاست بۆ سکاڵاکردن چووە بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگە. کە زەنگیان لێدا، بانگکرامە ئەوێ. ڕێکخەری خوێندنگە بە گرژیەوە پرسی:

-کوڕە ئەوە چ کارێکە کردووتە؟ بۆچی هاوڕێیەکەی خۆت ئاوا لێکردووە؟

وتم: مامۆستا، ئەو ناپاسەندە، جنێو بە حەزرەتی عومەر دەدا.

تا دەستێ گرتی، ڕاژدیێکی لە بناگوێم داو دە خولەکی پێنەچوو کە جانتاو دفتەرو کەل‌و پەلیان خستە بنهەنگڵم‌و لە خوێندنگە وەدەریان نام. بە گریانەوە گەڕامەوە ماڵەوە، مامم لە مەسەلەکەی پرسی‌و ڕووداوەکەم بۆ باسکرد، زۆر تووڕە بوو ئەویش شەپازللەیەکی خێواندە بناگوێم‌و گوتی:

-هەتیوە کەرە، ئەو سەرشێتیە یانی چی؟ مەگەر تۆ نوێنەری عومەری؟ ئەو ئەگەر غیرەتی هەیە با خۆی بێت‌و بەرگری لە خۆی بکات. تۆم ناردۆتە بەرخوێندن کە دەرس بخوێنی یا داکۆکی لە عومەر بکەیت؟.. بڕۆ ون بە لەبەرچاوم!

بەیانی لە جیاتی بچێتە فەرمانگەکەی خۆی لەگەڵم هاتە خوێندنگەو زۆر داوای لێبوردنی لە بەڕێوەبەرو ڕێکخەری خوێندنگەکە کردو بە تکاو پاڕانەوە ڕازی کردن کە دیسان وەرمبگرنەوە، هەڵبەتە بە گفتدان کە جارێکی تر ئەو ناماقوڵیانە نەکەم‌و چیتر ئەو سەرشێتیانە ئەنجام نەدەم، دەنا جاری دووەم دەربکرێم خواش پشتیوانیم بکات قبوڵم ناکەنەوە. هەروەها ئەوەشیان گوت کە ئەگەر دیسان منداڵەکان ئازاریان دام‌و جنێویان بە عومەر دا، بێم شکات‌و سکاڵای خۆم بە بەڕێوەبەرایەتی ڕابگەیەنم نەك خۆم تەمبێیان بکەم..

بە کەمێك شەرمەوە بەیانی چوومەوە پۆل، بەڵام وەك بڵێی ئەو مستەکۆڵەیە کاری خۆی کردبوو، چونکە ئیدی ئەو دیمەنە ناشیرین‌و ئازاردەرانە دووبارە نەبوونەوەو منداڵەکان ئیدی ڕەفتاری بە ئەدەبترو لە هەمان کاتدا نامۆیانەتریان بەرامبەرم دەنواند.

پ: زۆرن منداڵانی وڵاتی ئێمە، زۆرن کە بە برسێتی سەردەنێنەوە، برسی لەنێو تەراخوما، لەنێو سیل، سوورێژە، کۆکەڕەشە، زەردوویی، کەچەڵی، فەلەجبوون‌و.. و..، کە تەنانەت بەرلەوەی تێبگەن "هەن" لە نێودەچن. ڕەنج‌و نەخۆشی، لە کەمیی ڤیتامینەوە بگرە تا نەبوونی تەندروستی‌و نەزانین‌و کارەسات، کارنامەیەکی گەورەیە کە هیچ پێنووسێك بە تەنێ توانای بەتاڵکردنەوەی نییە. ئایا ئەو نووسەرو خاوەن قەڵەمانەی کە بۆ ئەو توێژە فراوانە لە ڕێی دوورەوە دەنووسن‌و دەشزانن کە یەك وشەی نووسینەکانیان بە گوێی هیچ یەك لەو لەشکرەی برسیەکان ناگات، دیسان دەتوانن لەو قەڵەمە ڕازی بن‌و دڵیان بەو نووسینانەیان ئاودەخواتەوە؟

و: ڕێزدار ساڵحی هێژا، ئەو خاوەن قەڵەمانەی کە لە ڕێی دوورو نزیکەوە بۆ ئەو کۆمەڵە بەرفراوانەی منداڵانی برسی‌و تراخومایی‌و وەرەمی‌و خوریکەیی‌و کۆکەڕەشەیی‌و زەردوویی‌و کەچەڵ‌و فەلەجە دەنووسن، چاوەڕێ دەکەی لەو نووسین‌و دەردەدڵ کردن‌و دڵسۆزی‌و هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگەی گۆڕاوی خۆیان بترازێ، شتێکی تریان لەدەست بێ؟ ئەوان جگە لەوەی دەردو ئازارەکانی کۆمەڵگە باس بکەن‌و ئەو بارە نالەبارە شرۆڤە بکەن کە تیایدا هەمان منداڵانی برسی‌و نەخۆش‌و بەجێماو لەنێو بێکەسی‌و بێنەوایی‌و نەخۆشیدا پەلەقاژە دەکەن‌و بەرلەوەی پێبگەن دەژاکێن‌و لەنێودەچن یا ئەگەر پێگەیشتن‌و گەورەش بوون کەسانێك دەبن بە نەخۆشی‌و ناتەواوی‌و نەزانی دەچنە نێو کۆمەڵ‌و لەکارکردن‌و خزمەتکردنی دەوڵەمەندان زیاتر شتێکی دیکەیان پێناکرێ، دەتوانن چی بکەن؟ تۆ بەو پرسیارەت یەکێ لە شیعرەکانت هێنایەوە بیرم کە لە ساڵی ١٩٥٤ بە بۆنەی هاتنە دنیای (ئالیهە)ی کچی یەکێ لە دۆستەکانی خۆم دامناوە. ئالیهە ئێستا زەماوەندی کردووەو منداڵیشی هەیەو باوکی کە برادەری من بوو نەماوە. ئەو ڕۆژەی کە من ئەو شیعرەم لەسەر داوای دایك‌و باوکی دانا، ئالیهە کچۆڵەیەکی بچکۆلە بوو کە بەوپەڕی نازو نیعمەتەوە پەروەردە دەکراو من کە دەبوا شیعرێك بۆ پیرۆزباییکردنی جەژنی لەدایکبوونی بڵێم دەمزانی لەم دەمەی کە لێرە ئاهەنگ بۆ لەدایکبوونی ئەو ساز دەکرێ، هەزاران هەزار منداڵی هەژارو برسی دەمرن‌و کۆمەڵگە دەردێکی ئەوان چارەسەر ناکات، بۆیە (شیعرەکەم بە شێوەیەك بوو کە نەك هەر بۆ ئالیهە بێت، بەڵکو بۆ سەرجەم منداڵانی کۆمەڵگەکەم‌و وەبیرهێنانەوەی ڕەوشی نالەباری ئەوانیش بێت).

بەڵێ، ساڵحی خۆشەویست، تۆ لە من باشتر دەزانی کە ئەو منداڵە نەخۆش‌و نەزان‌و تەراخومایی‌و وەرەمدارو کۆکەدارو کەچەڵ‌و فەلەجانە بەرهەمی ئەو بێدادیانە بوون کە هەبوون. هەرکاتێك منداڵانی کۆمەڵ نەك هی تاکە کەسێك بەڵکو هی هەموو کۆمەڵگە بوون‌و وڵات بووە خێزانێکی یەکگرتوو ئەوکات دەتوانین ئومێدەوار بین کە هەموو منداڵەکان لەژێر چەتری چاودێری‌و داکۆکیکردنی کۆمەڵگەدا دەبن‌و لە نەخۆشی‌و نەزانین دەربازیان دەبێ.

بەم پێیە، ئەوەش لەو نووسەرانە چاوەڕوان دەکرێ کە بۆ منداڵانی هەژار و نەخۆش شت دەنووسن کە بە باسکردن‌و شرۆڤەکردنی ڕەوشی منداڵان‌و کۆمەڵگە، خەڵکی لە خەو و بێئاگایی بە ئاگا بێننەوەو مێشك‌و بەرچاویان بە چرای زانست ڕۆشن بکەن، کە ئەمە چاوەڕوانییێکی زۆر مەزن‌و لە جێی خۆیەتی!..

پ: ئێستا کە لە منداڵیەکانتەوە دوایت‌و قسە گەیشتە ئێرە، بفەرموو کە چەند کتێبت بۆ منداڵان وەرگێڕاوە؟ کارەکەتان لە ڕووی حەزو خۆشەویستیەوە بووە یا بە ڕاسپاردەی دەزگاکانی بڵاوکەرەوە بووە؟ ئایا بە ڕاستی وەڵامی ڕاسپاردەی بڵاوکەرەوەکانت داوەتەوە یا..؟

و: پرسیارێکی باشت کردو دەرفەتێکت دایە من کە تا ڕادەیەك شێوەی کاری خۆم ڕوون بکەمەوە. من لە ڕاستیدا هەرگیز لەسەر داواو ڕاسپاردە کارێك قبوڵ ناکەم، بەڵکو دەبێ پێشتر بەرهەمەکە بخوێنمەوەو پەسەندی بکەم ئینجا مل بدەمە وەرگێڕانی، و لەو بارەیەشەوە بۆ خۆم پێوەرو پێوانەگەلێکم هەن کە دڵنیام مایەی قبوڵ‌و پەسەندی زۆرینەی ڕۆشنبیرانی دڵسۆزی کۆمەڵگەن. با بە کورتی چەندێکی ئەو پێوەرانە باس بکەم تاکو

بزانن چۆن بەرهەمێك بۆ وەرگێڕان هەڵدەبژێرم. جارێك لە هەڤپەیڤین لەگەڵ گۆڤاری ( (فەردای ئیران)یشدا باسمکرد کە من داگیرسێنەری فانۆسەو کارم ئەوە بووە کە لە قۆناغی تەمەنی کورتی ئەدەبی خۆمدا مێشکەکان بە پێشکەشکردنی بەرهەمی بەرجەستەی ئازادیخوازانی جیهان‌و خۆبواردن لە دەمارگیرێتی‌و وشك‌و برینگ‌و جەوت‌و ڕۆشنکردنەوەی هزرو برەودان بە عەشق‌و خۆشەویستی بەرامبەر بە هاوڕەگەزو خۆشەویستی‌و مرۆڤدۆستی‌و دیموکراسی‌و کارو کۆشش لە پێناو چاککردنی خودو کۆمەڵگە ڕۆشن بکەمەوەو ئەو پەیامە بە هەمووان ڕابگەیەنم. زۆر جار بووە کتێبێکیان بە هەقدەستێکی باش پێشنیاز کردووەو قبوڵم نەکردووە چونکە لەگەڵ پێوەرو پێوانەکانی خۆم جووت نەبووەو زۆرجار خۆم لەنێو چەندین کتێبی فەرەنسی کە دەمخوێندنەوە یەکێکیانم پەسەند کردوەو خستوومەتە بەرچاوی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە. لێرەدا خراپ نییە دوو نموونەتان بخەمەوە یاد: ساڵی ١٩٦٢ بوو، ڕۆژنامەی (کەیهان) بە دوایدا ناردم‌و گوتیان بە تەماین مانگانە کتێبێکی گیرفان چاپ بکەین‌و گەرەکمانە یەکەمین کارمان بە وەرگێڕانی تۆ دەست پێبکەین. ئەو کتێبەیش کە پێشنیازیان کردبوو خستیانە بەرچاوم بریتی بوو لە وەرگێڕانی فەرەنسیی کتێبی "کاتژمێری بیست‌و پێنجەم" بەرهەمی نووسەرێکی ناسراوی ڕۆمانیایی. پێم گوتن تا کتێبەکە نەخوێنمەوە ناتوانم وەڵامی ڕەت یا قبوڵکردن بدەمەوە. گوتیان بەرهەمەکە شاکارێکە کە سیاسەتی ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوایی کوتاوەو ڕێگایەکی بەرەو فەلسەفەی ڕۆژهەڵات خستۆتە بەردەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، دڵنیاین کە پەسەندی دەکەیت، جگە لەوەش تۆ وەرگێڕی‌و بە دوای کاردا دەگەڕێیت‌و ئێمەش کارت بۆ پێشنیاز دەکەین بە

هەقدەستێکی باش. پێکەنیم‌و گوتم: تا کارەکەم بە دڵ نەبێ قبوڵی ناکەم‌و هەقدەست بەلای منەوە بە پلەی دووەم گرنگی هەیە. کتێبەکەم خوێندەوەو ئەلحەقە لە ڕووی هونەری نووسینەوە لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بوو بەڵام وەڵامی ڕەدکردنەوەم دانەوە. دڵگران بوون‌و هۆکارەکەیان پرسی، گوتم لەگەڵ بیرو زەوقی مندا کۆك نییە. نووسەرەکە لەو کتێبەدا ڕۆژئاوایی بە زللەیەکی زۆر نەرم لەو جۆرانەی کە بۆ تەمبێکردنی منداڵانی بچکۆلە دەوەشێندرێن‌و پێیان دەڵێن "هەی بزۆز"، کوتابوو، بەڵام ڕۆژهەڵاتی دابووە بەر مست‌و پێلەقان. تازە ئەو ڕێیەی کە نیشانی کۆمەڵگەشی دەدات ڕێگەیەکی ئایدیاڵیانەو لەسەر بنەمای فەلسەفەی خەیاڵیی ڕۆژئاواو تێکەڵە لەگەڵ بیروباوەڕی بودایی‌و دەروێشیی ڕۆژهەڵاتی. هەقدەستەکەیان کردە دوو بەرابەرو من ئەگەرچی ئەوکات بە هۆی نەخۆشیی هاوسەرەکەمەوە زۆر پێویستم بە پارە هەبوو، بەڵام قبوڵم نەکرد. سەرەنجام کتێبەکەیان بە نیوەی ئەو هەقدەستەی کە یەکەم جار دایانە من، دایانە کەسێکی ترو وەرگێڕدراو چاپیان کرد بە ناچاری وەرگێڕانی کتێبێکیان بە خۆم سپاردو من کتێبی "مادام بوڤاری"ی نووسینی (گوستاڤ فلوبەر)م بە هاوکاری هاوڕێی خوالێخۆشبووم (ڕەزا عەقیلی) وەرگێڕاو کەیهان چاپی کرد. خودی ئەو هاوکاریە لەگەڵ خوالێخۆشبوو (عەقیلی)یش چیرۆکێکە کە ئێرە جێی گێڕانەوەی نییە.

ساڵی ١٩٦٥ ڕۆژنامەی (ئیتیلاعات)یش بە لاسایی ڕۆژنامەی کەیهان بڕیاری دا مانگانە کتێبی گیرفانی بڵاو بکاتەوەو بە دوای منیدا نارد کە دەمانەوێ یەکەمین کتێبمان بە وەرگێڕانی تۆ دەست پێبکەین. هەروەها گوتیان کتێبێکی (دیدرۆ)ی نووسەرو فەیلەسوفی فەرەنسیمان بۆ دیاری

کردووی بە ناوی "لا رولیژیوز" واتە (ژنە ئیماندارەکە) کە بەرهەمێکی سەرنجڕاکێشە. بە ڕێکەوت من ئەو کتێبەم خوێندبووەوەو گوتم قبوڵی ناکەم. وتیان بۆ؟ پێم گوتن ئەم کتێبە چیرۆکی ژنێکە کە لە دێرێکدا دەبێتە ڕەبەن (راهیبە) و کەشیشەکان لەو دێرەدا فریوی دەدەن‌و لەگەڵیدا ڕادەبوێرن. هەروا درێژەم بە قسەکەم داو گوتم نە ئێمە مەسیحین‌و نە دامەزراوەیەکمان بە ناوی دێر هەیە کە دەردو کێشەی ئەم کتێبە دەردو کێشەی ئێمە بێت. گوتیان خۆت کتێبت هەیە بماندەیتێ؟ لەو کات خەریکی وەرگێڕانی کتێبی (نان‌و شەراب) بووم کتێبەکەم پێناساندن. گوتیان نووسینی کێیە؟ گوتم هی (ئینیاتسیف سیلۆنە)یە، ئەو نووسەرە هاوچەرخە ئیتاڵیەیان نەدەناسی، چونکە هێشتا ئەو نووسەرە لە ئێراندا نەناسرابوو و هیچ کتێبێکی وەرنەگێڕدرابوو. قبوڵیان کردو، بە چاپکردنی ئەو کتێبە کە هەڵبەتە لە لایەن دەزگاشەوە هەندێ کەوتە بەر سانسۆرەوە، (سیلۆنە) بۆ فارسی زمانان ناسرا. دوای ئەوە بوو کە وردە وردە وەرگێڕەکانی تریش دەستبەکار بوون‌و چەند کتێبێکی تری ئەو نووسەرەیان وەرگێڕایە سەر زمانی فارسی. بەڵام لە ڕاستیداو بێ خۆهەڵکێشان شاکارەکانی سیلۆنە هەمان ئەو دوو کتێبەی (نان‌و شەراب) و (بەسەرهاتی پێشەوایەکی شەهید) یا (مەسیحییێکی هەژار)ن کە من وەرمگێڕاون، کتێبەکانی تری ئەو نووسەرە کە تا ئێستا لە وەرگێڕەکانی ترەوە خوێندوومنەتەوە، بە ویژدانەوە بڵێم ناگەنە ئاستی ئەو دوو بەرهەمەی.

ئێستا دوای ئەو پەراوێزڕۆییە دوورو درێژە با بۆ پرسیارەکەی بەڕێزتان بگەڕێینەوە کە تا هەنووکە چەند کتێبم بۆ منداڵان وەرگێڕاوە.

ساڵی ١٩٧٤ کە لەسەر بانگهێشتی سەرۆکی ئەوکاتی مەڵبەندی پەروەردەی فیکریی منداڵو نەوجەوانان بۆ کارکردن لەو دەزگایە داواکرام، بڕیار درا لەوێ جگە لە کاری ڕۆژانەی ئەدیتوریو وەرگێڕانە کاتیەکانی فەرمانگەیی، کتێبی منداڵانو مێرمنداڵانیش وەربگێڕم. چەند کتێبێکیان خستە بەردەستم، بەڵام لەوێش من ئەو مەرجەم هەبوو کە پێویستە خۆم کتێبەکە پەسەند بکەم ئینجا وەریدەگێڕم. بێ هەر گرفتێك ڕێککەوتینو لە ماوەی دوو سێ ساڵێك کە لەوێ بووم لە میانی کارە ئیداریەکان وێڕای تۆمارکردنی چەند کاسێتێك بۆ ناساندنی مۆسیقازانانی گەورەی ڕۆژئاوا کە گۆرانیو ئاوازیشیانی لەگەڵدا بوو و پێنج کتێبیشم بۆ منداڵو مێرمنداڵان بەم شێوەیەی خوارەوە وەرگێڕان:

١-(ماجرا جوی جوان) "لاوە سەر بە گۆبەندەکە"، بەرهەمی "ژاك سێرفۆن" ژنە نووسەری فەرەنسی کە ناوە ڕاستەقینەکەی بریتیە لە (ژاکلین موسارد). ئەو کتێبە کە خەڵاتی (شادی لە ڕێی کتێب)ی لە ساڵی ١٩٧٠ وەرگرتبوو، یەکەمین بەرهەمە کە لەو نووسەرە وەرگێڕدرا بێتە سەر زمانی فارسی. کتێبی ناوبراو لە مانگی ٦ی ساڵی ١٩٨٤ بۆ پێنجەمین جار چاپکراوەتەوە.

٢-(پۆلینا چشمو چراغ کوهپایە) "پولینا ڕۆشنایی قەدپاڵی چیا"، بەرهەمی (ئانا ماریا ماتوتە)ی ژنە نووسەری ئەسپانیایی کە بە هەڵە چاپە فارسیەکەی لە ژێر ناوی "پولیانا ڕۆشنایی کوێستان" چاپکراوە، ئەو کتێبەیش یەکەمین بەرهەمە کە لەو نووسەرەوە کرابێتە فارسی. کتێبەکە لە مانگی ١١ی ١٩٦٤ بۆ هەفتەمین جار چاپ کراوەتەوە.

٣-(باخانمان) "لەگەڵ خێزاندا"، بەرهەمی (هیکتۆر مالۆ) نووسەری ئەرەنسی کە پێشتر هەموو کتێبەکەم لەژێر ناوی (لە باوەشی خێزاندا) وەرگێڕاو چاپم کردبوو، دواتر هەمان وەرگێڕانم چڕو کورت کردەوە بە دەستپێداهێنان و پوختەکردنێك کە بۆ منداڵان و مێرمنداڵان ئەنجامم دا دووبارە لەژێر ناوی (لەگەڵ خێزاندا) دامە مەڵبەندی فیکریی منداڵان و چاپی کرد. ئەم کتێبە کتێبێکی زۆر ڕێنوێنیکەرو گرنگەو لە مانگی ٧ی ١٩٨٤ چاپی سێیەمی لێ بڵاوکرایەوە.

٤-"چیرۆکی منداڵیم"، نووسینی (چارلی چاپلن)ی هونەرمەندی گەورەی سینەما کە خودی چیرۆکەکە هەوڵ و تێکۆشانەکانی سەردەمی مێرمنداڵی ناوبراو تا ئەو کاتەی دەبێتە ئەو هونەرمەندە ناسراوەی کە پێی دەگوترێ (چارلی چاپلن) باسدەکات. کتێبەکە دوو جاران چاپکراوەو ئێستا باسی ئەوە دەکرێ کە دەستێکی تێدا بکێڕن و لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامیدا بیگونجێنن و بۆ جاری سێیەم چاپی بکەنەوە.

٥-(پێنج چیرۆك لە ئاندرسۆن) نووسەری گەورەی دانیمارکی (هانس کریستیەن ئاندرسۆن) کە پێشتر هەفت چیرۆك بوو، لە سەرەتاکانی شۆڕشی ئێران کە بڕیار بوو کتێبەکە بچێتە ژێر چاپەوە، دوو چیرۆکیان بە هۆی ناهەماهەنگی لەگەڵ پێوەرە ئیسلامیەکان لێهەڵگرت و پێنج چیرۆکەکە تەنها جارێك چاپکراوە. ئەمە و بێگومان هەموو ئەمانە بە گوێرەی هەڵبژاردنی خۆمەوە وەرگێڕدراون و چاپکراون.

پ: هەستی خۆشەویستی نواندن بەرامبەر ئەوانی دی تا چ ڕادەیەك خودی یا بەدیهێنانەیە؟

و: هەرچەندە بەرسڤی ئەم پرسیارە لە توانای مندا نییەو کاری فەیلەسوفەکانەو لەو بارەیەوە دەستەیەکیان مرۆڤ بە شەڕەنگێزو کین لە دڵ دەزانن. ئەو فەیلەسوفە (پێسیمیست)یان بەدبینانە، مرۆڤ بە جانەوەرێکی جۆری دڕندەکان دەژمێرن‌و بە پێی ئەو گریمانەیە ناتوانن بگەنە ئەو باوەڕەی کە مرۆڤ وەك خود بەرامبەر بە مرۆڤ مێهرو خۆشەویستی هەبێ‌و پێیان وایە وەك چۆن دوو سەگی نا ئاشنا لەگەڵ یەکتر توندوتیژانە پەلاماری یەکتر دەدەن‌و ددان لە یەکتر گرەدەگەنەوە مرۆڤەکانیش خود بە خود بەد سروشت‌و دژیەری یەکترن‌و پەلاماری یەکدی دەدەن، شەڕو شۆڕو پێکداهەڵشاخانە تاکەکەسی‌و بە کۆمەڵیەکانیان بە بەڵگە دێننەوە. گروپێکی تر کە بریتین لە فەیلەسوفە (ئۆپێتیمێست)یا گەشبینەکان بە پێچەوانەی ئەو تێڕوانینە ڕای خۆیان دەردەبڕن‌و مرۆڤ بە بوونەوەرێکی میهرەبان‌و بێ ئازار دەزانن، چونکە لەو باوەڕەوان کە مرۆڤ لەگەڵ جانەوەرە دڕندەکانی وەك گورگ‌و شێرو پڵنگ‌و شتی لەو جۆرە جیاوازە. دەڵێن (کریستۆف کۆلۆمب)یش لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی خۆی لەگەڵ سوورپێستەکانی دوورگەکانی (ئانتیل)دا لە جیاتی دڕندەیی‌و ئێش‌و ئازار، میهرەبانی‌و سەفاو خۆشەویستی بەدی کرد، شتێك کە ئەوە نیشان دەدا مرۆڤ لە سەرەتای دروستبوونیەوە هاوڕەگەزخواز بووە. بەهەرحاڵ بەندە چونکە کەسێکی گەشبینم‌و لە ژیانمدا هەمیشە هەوڵم داوە کە ئازارم بە مرۆڤ کە هیچ تەنانەت بە مێروولەش نەگات. لەگەڵ تێڕوانینی فەیلەسوفەکانی گروپی دووەم هاوڕام بە تایبەت کە ئادەمیزاد گیاندارێکی کۆمەڵایەتیە و یەکێك لە کاردانەوەکانی کۆمەڵایەتیبوون بریتییە لە خۆشەویستی‌و یەکترویستن‌و پشتیوانیکردن‌و یەنادانی یەکتری.

ئەو شەڕو خوێنڕێژیانەی کە لەنێو مرۆڤەکاندا دەیانبینین پەیوەندی بە خەسڵەتو غەریزەی زاتی ئەوەوە نییەو زیاتر وەك داکۆکیکردن لە خۆ یا بە هۆی ئابووری‌و ترسی برسێتی یا لە پای پەیڕەویکردن لە بیروپاوەڕگەلی پووچ‌و خوراف‌و خەیاڵاوی‌و کورتبینی‌و پلەوپایە خوازیەوەیە.

هەرچی بێ، خەسڵەتی کۆمەڵایەتیبوون، بەڵگەیەکی بەجێیە لەسەر خۆشەویستی نواندن‌و هاوڕەگەز دۆستی زاتیی ئادەمیزادو هەموو ئەو هەوڵ‌و تێکۆشانەی کە ئەمڕۆکە مرۆڤ لە ڕێی خۆشگوزەرانی‌و بەختەوەری‌و سەلامەتی‌و خۆشی‌و تەندروستیی هاوڕەگەزەکانی خۆی دەیدا، نیشانەیەکە لەو ڕاستیەی سەرەوە.

پ: ئایا ئەوە ڕاستە کە هەرچەند زانست‌و زانیاریی مرۆڤ شتێکی زاتی بێت، عەشق‌و خۆشەویستی بەرامبەری مەزنترە؟

و: مەبەستتان لە زانستی زاتی تێنەگەیشتم چییە، چونکە پێم وا نییە زانستێکی زاتی بوونی هەبێ، نەکا مەبەستتان عەقڵی زاتی بێت، وەك چۆن (مەولانا) دەفەرموێ:

(عەقڵ دوو عەقڵە، یەکەم ئەوەی وەدەست دەهێندرێ‌و لە خوێندنگەدا بە منداڵی فێری دەبێ، عەقڵەکەی تر لە نێو گیاندایە چاوگەکەی چاوگی ژیانە).

بەم پێیە عەقڵ بۆی هەیە زاتی بێت، وەك چۆن کەسانێك بێ ئەوەی بخوێنن‌و بچنە خوێندنگە، مرۆڤی عاقڵ‌و تێگەیشتوون‌و هەندێکیش ئەگەر عەقڵ‌و مەعریفەتێکیان هەیە ئەوا لە ڕێی وەدەستهێنان‌و ئەزموونی ژیان‌و لە ئەنجامی خوێندنی زانست‌و زانیاریەوە دەستەبەریان کردووە. بەڵام خودی زانست‌و زانیاری بە ڕای من هەرگیز شتێکی زاتی نیە، بەڵکو دەبێ

ئەزموونگەی کۆمەڵگە یا بە هۆی دەرس و هەوڵ و تێکۆشان و موتاڵاکردنەوە وەدەست بهێندرێ. لە ڕاستیشدا مرۆڤ زیاتر بە دوای خوێندنی ئەو ڕشتەیەی زانستدا دەڕوا کە خۆی حەزی لێیەتی و لێرەدایە کە عەشق بەرامبەر ئەو زانستە دروست دەبێ. من خۆم یەکێکم لەوانەی کە بە ڕاستی عەشقم بەرامبەر کاری وەرگێڕانەوە هەیە و فێربوونی زمانی فەرەنسی بە عەشق و چێژێکی سەیرەوە پەیگیری دەکەم.

پ: لەوانەیە بۆ زۆر لە خوێنەران جێی سەرسوڕمان بێ کە وەرگێڕێک، ئاوا وەك دەروونناسێکی منداڵان سەرقاڵی پرسی پەروەردەو چەندوچوونی بەهاکانی فێرکردنە. بەڵام لەبەرئەوەی کە لە نزیکەوە دەتناسم، ئەو مافە بە خۆم دەدەم کە باوك و ڕاهێنەری چەندین منداڵ بوویت، لەو بارەیەوە چەند پرسیارێکت لێبکەم.

..بەڕێز قازی! کاتێ کە بۆ فێربوونی هەر هونەرێك دوو قۆناغی زاڵبوون بەسەر لایەنی تیۆری و زاڵبوون بەسەر لایەنی کرداری دەبێ تەی بکرێ، ئەی بۆ فێربوونی هونەری خۆشویستن و میهرەبانی نواندن بەرامبەر بە منداڵان دەبێ چ بکرێ؟ ئایا منداڵێك توانای تەیکردنی ئەو ڕێگایەی هەیە؟ ئەگەر نییەتی: چ بکرێ باشە؟

و: من هەرگیز نەمگوتووە کە لە دەروونناسیی منداڵ و پرسە پەروەردەییەکانی منداڵاندا شارەزاییم هەیە یا ڕۆڵێکم گێڕاوە، تەنها وەرگێڕانی چەند کتێبێکیش بۆ منداڵ و مێرمنداڵان ناکرێ بەڵگەیەك بێ بۆ سەلماندنی ئەو بابەتە.

خۆشم گەرچی خاوەنی پێنج منداڵ بووم، بەڵام سێیانیان واتە دوو کوڕو کچێکم هەر بە منداڵی مردن و تەنها کوڕێك و کچێکم ماونەتەوە کە

کوڕەکەم لەگەڵ ژنێکی بیانی زەماوەندی کردووەو دوو منداڵیان هەیە کە بە داخەوە ئاشنایی نییە لەگەڵ زمانی فارسیدا کە زمانی دایکیی نییە، و کچەکەشم شووی کردووەو دوو منداڵی هەن.

من لە پەروەردەکردنی ئەو دوو منداڵەشم کارێکی زۆر گرنگم نەکردووەو هەرچەند کچەکەم توانیویە لیسانس لە زانستی پەروەردەدا وەدەست بێنێ‌و کچێکی هۆشیارو خوێندەوارەو شیعریش دادەنێ. بەڵام کوڕەکەم ڕێگایەکی تەواو جیاواز لە ڕێگای منی هەڵبژاردووەو بۆتە میکانیسیەنی ئۆتۆمبێل، بەم پێیە، هیچ کامیان بەو شێوەیەی کە من ویستوومە دەرنەچوون، بۆیە ناتوانین بڵێین من لە پرسی پەروەردەو ڕاهێناندا شارەزایی‌و پسپۆڕییێکم لە خۆم نیشان داوە.

زیاتر پەروەردەی منداڵان تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەست‌و گرێدراوی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییەیە کە لە وڵاتدا حوکمڕانەو ئەگەر هاتوو سیستمی حوکمڕان سیستمێکی پێشکەوتوو و واقیعبین نەبوو کێشە و ئاستەنگێکی زۆر لەسەر ڕێی پەروەردەی منداڵان‌و گەشەی فیکریان قوت دەبێتەوە. نازانم تێڕوانینی تۆ لەو بارەیەوە دەبێ چۆن بێت..

پ: بەها، قورسایی، کاریگەری‌و کارتێکردنی ئەدەبیاتی منداڵان لەم وڵاتەدا چۆن دەبینی؟

و: وەڵامی ئەو پرسیارەم تا ڕادەیەك لە وەڵامی پرسیارەکەی پێشتردایەوەو لێرە دیسان دووپاتی دەکەمەوە کە ئەدەبیاتی منداڵان لە هەر وڵاتێکدا لەژێر کاریگەریی زۆری ئەو سیستمە تایبەتەدایە کە حوکمڕانە لەو کۆمەڵگەیەدا، تەنها لە کۆمەڵگەیەکی ئازادیخوازو واقیعگەرادا دەتوانین

ئومێدەوار بین کە بەهاو کاریگەریی ئەدەبیاتی منداڵان لە گەشەی فکریو دروستکردنی کەسایەتیاندا ڕۆڵێکی مەزنو باشی هەیە.

پ: ئایا پێت وا نییە کتێبی (ماسیە ڕەشە بچکۆلە) بەر لەوەی کە هۆشیارکەرەوە بێ، جوڵێنەرێك بێ بۆ سەرهەڵدانی چالاکیو هەنگاوی تاکەکەسیانەو قارەمانی نواندن؟

و: تا ئەو شوێنەی لە بیرم بێ دوو وتارم لەسەر هەڵسەنگاندنو شرۆڤەی ماسیە ڕەشە بچکۆلە خوێندونەتەوە، یەکێکیان هی کاك (مەنوچێهری هەزارخانی) کە هەڵێنجانێکی وەك ئەوەی ئێوەی هەیەو چالاکیو هەنگاوی ماسیە ڕەشە بچکۆلەی بە جوڵەیەك زانیوە بۆ سەرهەڵدانی بزاوتە تاکەکەسی-قارەمانیەکان، و وتارەکەی تر هی کاك (ئیحسانی تەبەری)یە کە دەتوانین بڵێین ڕەتدانەوەیەکی تێروانینی بەڕێز (هەزارخانی)یەو بزاوتی ماسیە ڕەشە بچکۆلەی بە هەوڵێك زانیوە لە ڕێی جیابوونەوە لە خەباتو تێکۆشانە تاکەکەسیەکانو پەیوەستبوون بە دەریا واتە تێکەڵبوون بە جۆشو خرۆشو لافاوی بزاڤی کۆمەڵانی بەرفراوان.

من لەم دەمەدا کتێبی ماسیە ڕەشە بچکۆلەم لەبەردەستدا نییە تا چاوێکی تری پێدابخشێنمەوەو ئەوەی کە لە بارەیەوە دەیزانم تەنها لە هەمان ئەو دوو وتارەوەیە کە باسم کرد چەند ساڵ پێش ئێستا خوێندوومنەتەوە. خودی کتێبەکەم ڕەنگە بیست ساڵ بەر لە ئێستا خوێندبێتەوە تا ئەو جێیەی کە لە سەرجەمی ئەو خوێندنەوانە وەبیرم بێ ئەوەیە کە ماسیە ڕەشە بچکۆلە لەو قەڵەمڕەوە تەنگەبەرو سنوردارەی ئەو ڕووبارەی کە تیایدا مەلە دەکات بوارو مەیدانێك بۆ چالاکیی خۆی بەدی ناکاتو گەرەکیەتی بەهەر نرخێك بێت خۆی بگەیەنێتە دەریا تاکو

جیهانێکی گەورەترو مەیدانێکی فراوانتر بۆ هەوڵو تێکۆشان دەستەبەر بکاتو هاوئاهەنگ لەگەڵ کۆمەڵی بێ ژمارەی ماسیەکانی تر کە چارەنووسێکی کارەساتباری وەکو چارەنووسی ئەویان هەیە، چالاکی بکاتو تێبکۆشێ. بەهەر پێوانەیەك بە گوێرەی ئەوەی کە لەو وتارانەو لە خودی کتێبی ماسیە ڕەشە بچکۆلەم وەبیر بێت بە پێچەوانەی تێڕوانینی ڕێزدار هەزارخانیو خودی بەڕێزتان، بزاڤ و چالاکیی ماسیە ڕەشە بچکۆلە بزاڤو جوڵانەوەیەکی تاکەکەسیو قارەمانی نواندن نییە، بەڵکو بە بڕوای بەندەش تێڕوانینی بەڕێز ئیحسانی تەبەری تێڕوانینێکی دروستە و هەوڵی ماسیە ڕەشە بچکۆلە هەوڵێکی شۆڕشگێڕانە و جەماوەریە. جا ئەمە پەسەند دەکرێ یان نا، نازانم..

پ: من ناڵێم ڕاستیەکان لەبەرچاو نەگرینو بڵێین لە منداڵی ئەم سەردەمە، مرۆڤێکی خەیاڵیو ئەفسانە ساز دروست بکەین، بەڵکو ئامانجم ئەوەیە کە منداڵ دەبێ دنیای بچوك، جوان، ڕەنگینو ناسكو ڕۆشنی خۆی هەبێ (تەنانەت لە جیهانی هەژاریشدا)، دەنا ئەگەر لە ئێستاوە پالی پێوە بنێینو بمانەوێ هەرچی زووە لە قۆزاخەی خۆی دەرچێ، ئەوا بمانەوێ یان نا لە ئایندەیەکی نزیکدا جگە لە دەمارگیری، خەمۆکیو دەستپاچەیی، ڕەفتارێکی تری لیٚ بەدی ناکرێ. دەمویست لەو بارەیەوە ڕای ئێوە بپرسمو ئەگەر بکرێ سەبارەت بەو پرسە زیاتر قسەمان بۆ بکەیت.

و: منیش تا ڕادەیەك لەگەڵ تێڕوانینی تۆ هاودەنگمو پێم وایە لە هەمان کاتدا کە نابێ ڕاستیەکان (واقیعیەتەکان) لە منداڵ بشاردرێنەوەو کەسێکی خەیاڵیو ئەفسانەسازیان لێ دروست بکرێ دەبێ دنیای ناسكو ڕۆشنو جوانی خۆیشیان بۆ بپارێزرێ، و من لە هاوجووتکردنی ئەو دوو

ئەرکەدا هیچ ناکۆکیەك نابینم. بەو مانایەی کە باوەڕم وایە لە هەمان کاتدا کە واقیعیەتەکانی ژیان بە شێوەی حەکایەت یا چیرۆکی کورت یاخود شیعر بە گوێی منداڵدا بگەیەندرێ‌و بۆی بنووسرێ لە یاریەکانی منداڵان‌و دنیای جوان‌و خۆت واتەنی دنیای ڕەنگینی خۆیشی قسەبکەین‌و سەرگەرمی بکەین. لە ڕاستیدا من پێم وایە جگە لە باسکردن‌و دەرخستنی ڕاستیەکان نابێ بە زمانێکی تر قسە لەگەڵ منداڵدا بکرێ، و ئەو پرسانەی کە نەوەی ئێمە پێیەوە گیرۆدەیە و ئێمەش فێرکردنی بە لاوان بە کارێکی پێویست دەزانین، بێ ئەملاو ئەولا بوونی ئەو سیستمە چەوسێنەرو ستەمگەرەیە کە سەرمایەدارانی گەورە بۆ چەوساندنەوەی چینی کرێکارو زەحمەتکێش بەرپایان کردووە. گومانی تیا نییە کە ناتوانین ئەو بابەتە بەو وشکی‌و سەختییەوە فێری منداڵ بکەین‌و ئەوەش شتێکی پێویست نییە، چونکە وەك خۆت گوتت منداڵ دوچاری دەمارگیری‌و خەمۆکی دەبێت بەڵام دەتوانین لەسەر بنەمای هەمان ئەم ڕاستیە و زۆر لە واقیعیەتەکانی تری ژیان وەکو چاندنی عەشق‌و حەزکردن لە خوێندن، لە ئازادی، لە برایەتی‌و دۆستی، لە ڕێگرتن لە باوەڕگەلی خوراف‌و خەیاڵاوی، لە پێویستی هەوڵ‌و خەبات لە پێناو هێنانەدی ماف‌و نەهێشتنی ستەم‌و شەڕەنگێزی بە زمانی سادەی شیعر یا چیرۆك بۆ منداڵان بگوترێ‌و بنووسرێ‌و بیروهۆش‌و ئاوەزیان بەو ڕاستیانە ئاشناو گۆش بکرێ تا کاتێك کە گەورە دەبن خۆیان بە سنگ فراوانی‌و هێزی دەرککردنی خۆیان پەی بە ڕاستیەکان‌و دەردو ئازارەکانی کۆمەڵگەی خۆیان ببەن. بەهەر حاڵ نابێ درێغ لە دەربڕینی ڕاستیەکان بە زمانی سادە بۆ منداڵان بکرێ‌و چەند باشترە کە بە زمانی خۆشیانەوە قسەیان لەگەڵدا بکرێ وەك (مەولانا) دەفەرموێ:

"چونکە سەروکارت لەگەڵ منداڵدا هەیە
کەوابوو دەبێ زمانی منداڵی فێر بیت"

بە داخەوە نە لە ڕابردوو و نە لەم کاتەی ئێستادا بەڕێوەبەرانی کاروباری کۆمەڵگە بە هۆی سەرقاڵی زۆریان بە کاروباری تاکەکەسیو سیاسیی خۆیان بواری خەریکبوون بە پەروەردەی فکری منداڵانو مێرمنداڵانیان نەبووەو نیانە و ئەوەی کە پێویستە بۆ گۆشکردنو گردنەوەی فکرو ئاوەزی منداڵان بە شێوازێکی دروست ئەنجام بدرێ، نایکەن. منداڵ تەنها کاتێك ئەو ئومێدەی لێدەکرێ کە مرۆڤێکی بەهادارو شەرافەتمەندی لێدەرچێ کە لە ڕێی ئەدەبیاتو ڕاهێنانی منداڵانەوە لەگەڵ ڕاستیەکانی ژیانو واقیعیەتەکانی سیستمی باڵادەست بەسەر کۆمەڵگەو لەگەڵ سیستمی چەوسێنەرانەی ستەمکاران ئاشنایی پەیدابکاتو نەهێشتنی ستەمو چەوسانەوە لەسەر خەڵکی هەژار و چەوساوە بە کارو ئەرکە ئەخلاقیو نەتەوەییەکانی خۆی دابنێ. هەموو شیعرو چیرۆکە جوانەکانی منداڵان دەبێ لەسەر بنەمای ئەو ڕاستیانە دابڕێژرێنو گومانی تیا نییە کە منداڵ دەبێ بە ساڵان لەو دنیایە شیرینو ڕەنگینەی خۆیدا بهێڵرێتەوەو نابێ ئەو کەیفو خۆشیو چێژە ڕۆحییە منداڵیەی لێ بسەندرێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستە وردە وردە و کەم کەمەش لەگەڵ ڕاستیەکاندا ئاشنا بکرێو ڕۆژ بە ڕۆژو مانگ بە مانگو ساڵ بە ساڵ ئەو ئاشنابوونەی فراوانترو زیاتر بکرێت تاکو نەوەی ئەو مرۆڤانەی وەك (ئەبو موسلیمی خوراسانی) و (مازیار) و (بابەکی خوڕەم دین) و (باقرخان) و (ستارخان) و کۆڵۆنێل (محەمەد تەقی خان) و ئازادیخوازانی تر کە بۆ چاککردنی ژیانی کۆمەڵانی خەڵكو ڕزگارکردنیان لەژێر کۆتو بەندی ستەمو خورافیات

ئێدەکۆشان، لەنێو ئەچێ‌و ئەمەش بە هەوڵ‌و هیمەت‌و کارزانیی باغەوانە شارەزاو دڵسۆزەکان دێتە دی، ئەو باغەوانانەی کە لە باغچەیەکی نەمام‌و شەتلی ئەورەس ڕۆژێك دارستانێکی چڕوپڕ دێننە بەرهەم کە هیچ شتێك ناتوانێ بیبڕێ‌و پێیدا ڕەت ببێت.

پ: من پێم وایە کە ئەدەبیاتی منداڵان لەم وڵاتەدا بە شێوەیەکی نادروست‌و پەلەپەل دەرکەوتووەو تا ئێستا هەرچی بە ناوی شیعرو چیرۆك بۆ منداڵان (جگە لە چەند کتێبێك کە ئەوانیش کەم‌و بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن) خراونەتە بازاڕی کتێبەوە، سێبەرێکی سستی ناتەواوی ئەو ژیانە واقیعیەی منداڵانن کە چاوەڕوان دەکرا لە تەك شیعرو چیرۆك‌و ڕۆماندا دەربکەوێ. ئایا بەڕێزتان پێتان وایە کە دەبێ چاوەڕێی دەرکەوتن‌و سەرهەڵدانی وەرزێکی تر بین لەو بوارەدا؟

و: بە داخەوە نەك هەر دەبێ چاوەڕوانی وەرزێکی تر بین، بەڵکو دەبێ چاوەڕێی ئەوەیەکی تریش بین، چونکە ئەوەی ئێستا وەك کتێبی چیرۆك‌و شیعرو شتی تر بۆ منداڵان بڵاو دەکرێنەوە نەك هەر یارمەتییێك بە گەشەی هزری‌و پەروەردەی ڕۆحیان بە ئاڕاستەیەکی دروست نادات، بەڵکو زۆرجار دەبێتە مایەی لە ڕێ لادان‌و سەرلێشێوانیشیان. بە بڕوای من ئەمە ئەرکی دایك‌و باوکانە کە هەرکاتێك بینیان منداڵ خەریکی خوێندنەوەی شتێکە کە نەك هەر لە ڕووی جوانکاری چیرۆکی‌و سەرگەرمی منداڵان جێی سەرنج نییە بەڵکو ڕێونکەریشە، پێشیان لێبگرن یا بە ڕێنوێنیکردنیان لە خوێندنەوەی ئەو بابەتانە لە ڕێی جەوت‌و ناواقیعی دەربازیان بکەن‌و ڕاستیەکانیان نیشان بدەن. بەڵام بە داخەوە ئەو دایك‌و باوکانە زۆر کەمن کە خۆیان لەگەڵ ڕاستیەکانی ژیاندا ئاشناییان هەبێ‌و بتوانن ڕێنوێنیکەری

باش بن بۆ منداڵەکانیان. لەبەرئەوەیە کە دەڵێم دەبێ چاوەڕوانی ئەوەیەکی تر بکەین‌و بە ڕاستی ئەرکێکی پیرۆز لەسەر شانی نووسەران‌و شاعیرانی واقیعگەراو ئازادیخوازە کە بە ئاڕاستەیەکی دروست ڕێنوێنی منداڵان بکەن‌و ئەمە بە ئەرکێکی ویژدانی خۆیان بزانن‌و ئەنجامدانی ئەو ئەرکە بکەنە خەمی خۆیان.

پ: لەو ڕووەی کە نووسەرانی ئەدەبیاتی منداڵان هەوڵ دەدەن تێڕوانین‌و ئاڕاستە سیاسیەکانی خۆیان بە جۆرێك دەرخواردی منداڵان بدەن، ئایا مایەی داخ‌و کەسەر نییە؟ ئایا پێت وانییە کە فێربوونی ڕق‌و کینە سیاسیەکان لەم تەمەنەدا، جگە لەوەی لە ئایندەدا مرۆڤێکی تاکڕەوو بێبەزەیی دروست دەکات، شتێکی تری پێنابڕێنێ؟

و: لە تۆ دەپرسم ئایا ئێمە تا هەنووکە جگە لە (سەمەدی بێهرەنگی) کەسێکمان بە مانای دروستی نووسەری ئەدەبیاتی منداڵان هەبووە کە بۆچوونە سیاسیەکانی خۆیان دەرخواردی منداڵان دابێ؟ جگە لەوەش مەگەر سەمەدی بێهرەنگی بابەتی خراپ و نادروستی فێری منداڵان کردووە؟ من باوەڕناکەم شتی وا هەبێ. یەکەم ئەو بابەتانەی کە بێهرەنگی کردوونی بە پایە و هەوێنی چیرۆکەکانی خۆی هەموویان دروست‌و لەگەڵ واقیعیەتدا تەریب‌و گۆکن‌و دەتوانین ئومێدەوار بین کە ئەگەر نێوەڕۆکی سیاسیشیان هەبێ مرۆڤی تاکڕەوو بێبەزەیی‌و دۆگماتیکیان دروست نەکردووە. لەوەش گەڕێین زۆرتری ئەدەبیاتی منداڵانی ئێمە، وەرگێڕانی کتێبی بیانین کە من خۆم چوار پێنج دانەم لەوانە وەرگێڕاوە و هەمووشیان هەوڵدانێکن لە ڕێی داهێنان‌و ئاشناکردنی منداڵان بە واقیعیەتەکانی کۆمەڵگە. لێرەوەیە کە ئەگەر نووسەر یا وەرگێڕو تەنانەت شاعیریش،

مرۆڤێکی خاوەن ئیلتیزامو خاوەن پەیام بێتو باوەڕی بە پەروەردەکردنی منێلکە دروستو واقیعیگەراکان هەبێت دەزانێ کە کتێبی منداڵانو نەوجەوانان چۆن بنووسێ کە شان بە شانی چیرۆکسازی بۆ سەرگەرمیو چێژپێدان بە منداڵان ڕاهێنەرو ڕێنوێنکەریش بێت. وەرگێڕەکانیش دەبێ خۆیان بە وەرگێڕانی ئەو کتێبانە خەریك بکەن بۆ منداڵان کە وێڕای شیرین بوونو سەرگەرمکردن مایەی فێرکردنو ڕاهێنانیش بنو من لەو بوارەدا بێ هیچ جۆرە مەبەستێکی خۆهەڵکێشان، چەند وەرگێڕانێك کە بۆ پێگەیاندنو پەروەردەی فکری منداڵو نەوجەوانان ئەنجامم داوە بە نموونەو گەواهی دێنمەوە، وەك (لاوە سەربەگۆبەندەکە)، پولینا ڕۆشنایی هەدپاڵی چیا، چیرۆکی منداڵیی من، لەگەڵ خێزاندا- و بە تایبەت جەخت لەسەر (لەگەڵ خێزاندا) دەکەمەوە کە هەرچۆنی بێ وەرگێڕە لاوەکان ئەم کتێبە بخوێننەوە تا بۆیان دەربکەوێ کە چ جۆرە کتێبێك بۆ ڕۆشنبیرکردنی منداڵان هەڵببژێرنو هەموو منداڵەکانیش ڕادەسپێرم کە هەر دەبێ ئەم کتێبە بخوێننەوە تا ببینن چەند لە گەشەو گۆشکردنی هزرو دیاریکردنی شتە دروستەکان لە نادروستەکانیان کاریگەرە.

شاعیرە لاوەکانیش دەبێ پەیڕەوی ئەو دیدگایە بکەنو پێویستە ئەو شیعرانەی کە بۆ منداڵان دایدەنێن لەو جۆرانە بانی ڕێنوێنکەرو ڕۆشنکەرەوە بنو ئەمەو هەموو ئەمانە لە نووسین یا وەرگێڕان یاخود شیعرەوەو بگرە تا هەر نووسینێکی تر کە بۆ ڕێنوێنیکردنی منداڵان دایدەنێن دەبێ زمانێکی سادەو مایەی تێگەیشتنیان بۆ منداڵان هەبێ، ئەگەرنا نووسینی سەختو ئاڵۆز یا وەرگێڕانی نارەوانو نارێكو شیعری

دزێوو وشكو برینگ، منداڵ هیچیان لێتێناگاتو ڕەنجو ماندووبوونی نووسەر یا شاعیر یا وەرگێڕەكە بە فیڕۆ دەڕوات.

پ: بەڕێزت لە بنەماڵەی مەزنی قازیەكانی مهابادی، خەڵكی مهابادو كوردی. لە یادو بیرەوەریەكانی قۆناغی لاویتان لە كوردستانو لەو ساڵانەی كوردستان قسەمان بۆ بكە.

و: لە دەستپێكی ئەم هەڤپەیڤینەدا كەم تا زۆر شتگەلێكم سەبارەت بە ژیانی خۆم باسكرد، ئێستاش كە حەزت لێیە باسی یادو بیرەوەریەكانی سەردەمی لاوێتیم لە كوردستانو ئەو ساڵانەی ئەوێت بۆ بكەم دیسان بۆ كتێبی چاپ نەكراوو تەواو نەبووی "بیرەوەریەكانی وەرگێڕێك" دەگەڕێمەوەو دیمەنێكی بۆ خاتری هەستی هەستیارانەی بەڕێزتانو خوێنەرانی خۆشەویست دەگێڕمەوە كە وێرانی شیرینیو پەروەردەكەرانەی ناسكو خۆشیش بێ. ڕووداوەكە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێك كە من لە گوندی (سریلاوا) لای شێخ ئەحمەدی زڕ مامم دەژیام، ئەو مامەم لەگەڵ باوكم لە دایكێك نییە. لەو دەم، مامم لە گوندێكی تر بە ناوی (یالآوای خواروو) خەریكی دروستكردنی خانوو بوو و یەكێك لەو چوار ژنەی كە لە سریلاوا هەیبوون زۆر نەخۆش بوو كە دەبوا من لەگەڵ (نەزاكەت)ی كارەكەرمان لە سریلاواوە چووبامە یالآواو مامەم ئاگادار بكەمەوە كە بۆ چارەسەركردنی ژنەكەی بیرێك بكاتەوەو خۆی بگەیەنێتە سریلاوە. ئێستا كە پێشینەی ڕووداوەكە ڕوون بووەوە، سەرنجی نووسینە وەرگێڕاوەكەی (بیرەوەریەكانی وەرگێڕێك) بدەن:

"تیشكی خۆر ڕەنێك بەرزببووەوە كە لەگەڵ (نەزاكەت) گەیشتینە یالآوای خواروو. مامەم لەسەر ئیش بەدیار كرێكارەكانەوە بوو و

بەهۆشکەوتنی ژنە گەورەکەیمان پێڕاگەیاند. کاتژمێرێك دواتر، شێخ داوای ئەسپێکی کردو بە سواری ئەسپ بەرەو سریلاوا هاژوای.

"ئەزاکەت دەبوا پیادە بە هەمان ئەو ڕێگایەی کە پێیدا هاتبووین بگەڕێتەوەو منیش لەگەڵ خۆیدا بباتەوە، بەڵام چارەنووس وا کەوتەوە کە ئەو بە تەنها بگەڕێتەوە: لە حەرەمسەرای دایکی شێخەوە، لە لایەن شێخ زادە بانوو —زڕ دایکی باوکم-ەوە ئاگادار کرامەوە کە ئەو زۆر حەزی لێیە بمبینێو فەرمانی داوە هەرچۆنێ بێ دەبێ دوای نیوەڕۆ بمبەنە حوزوری.

"من ئەو زڕدایکەی باوکمم تا ئەوێ ڕۆژێ نەدیبوو و تەنها ناوبانگم بیستبوو. دەیانگوت بە گەنجی تا بڵێی جوانو شۆخو شەنگ بووەو باپیرم دڵخواستەی بووەو ئەو دڵخوازیە وای لێهاتووە کە بیخوازێو زەماوەند بکەن. هەر ئەو ژنە بوو کە (فەیروزە خانم)ی ئەنکمی دیقی مەرگ کردو منداڵەکانی ئەوی واتە باوکمو دوو مامی ترمی لەبەرچاوی باپیرم خستنو دەربەدەری کردن. ئێستا ئیدی پیربوو و بە قوتبو مرادی ژنان دەژمێردراو هەروەك چۆن لەنێو موسڵمانانی (سوننی)دا پیاوان شێخیان هەیەو لە هەموو کێشەو پرسە ئاینیەکاندا پەیڕەویان لێدەکەن، ژنانیش شێخیان هەیە و پەیڕەوی لێدەکەن.

"ناوبانگی پاکیو پیرۆزیو پارێزکاری شێخ زادە بانوو لە سەرانسەری ئەو ناوچەیە دەنگی دابووەوەو تەنانەت دێهاتیە سادە و ساویلکەکان سوێندیان دەخوارد کە پەرجوو و کەرامەتیان لێبینیوە. دەیانگوت بێگەردیو پاکیو حەیاو حیجابی ئەو بە ڕادەیەکە کە چۆلەکەی نێریش بۆی نییە لەسەر درەختەکانی حەوشە و ماڵی ئەودا هەڵنیشێ، تا بگات بە پیاوی نامەحرەم کە بتوانێ ڕوخساری ببینێ. بەم وێناکردنە، چوونی من

بۆ لای ئەو کە لە سەر داوای خۆیشی بوو هیچ بەربەستێکی تیا نەبوو، چونکە یەکەمیان من بە نەوەی ئەو دەژمێردرام‌و نامەحرەم نەبووم، دووەمیش هێشتا منداڵ بووم‌و نابالغ.

"نازانم بۆچی من هیچ شۆڕو شەوقێکم بۆ ئەو دیدارە لە خۆمدا هەست پێنەدەکرد. عەسرێکی درەنگ بوو کە کەسێك لە حەرەمەوە هاتە حەوشەی دەرەوەو هەواڵی هێنا کە من دەتوانم بچمە حەرەمەوە. هەستام لەگەڵ ئەودا بەرەو حەرەم کەوتمە ڕێ. بەنێو داڵانێکی باریکدا کە ئەملاو ئەولای بە درەختی ئاڵوباڵو گیرابوو ڕەت بووین، هەرکە گەیشتینە حەوشەی یەکەم پیاوە ڕێنوێنیکەرەکە منی سپاردە دوو ژن‌و خۆی کە ئیدی مۆڵەتی چوونە پێشتری نەبوو، گەڕایەوە.

"لە دوو حەوشەی پێچاوپێچی تر ڕەت بووین تا گەیشتینە بەردەم پلیکانەکانی حەرەم. کە لە پلیکانەکان بە سەردەکەوتم دڵم لە پێشان توندتر لێی دەداو هەناسەبڕکێم پێکەوتبوو. چووینە نێو ژوورێکی نیوە تاریک‌و تا ڕادەیەك فراوان کە دوو سێ پیرەژن لە لای سەرەوە دانیشتبوون، لەولای ئەوانەوە لە بنەبانی ژوورەکە دوو گوردێك ڕاخرابوو بەڵام کەسی لەسەر نەبوو، سڵاوم کردو وڕوکاس ببووم، چونکە نەمدەزانی کامەیان شێخ زادە بانووە. ئیزنی دانیشتنیان دامێ‌و چاك‌و چۆنیان لەگەڵ کردم. دەرکەوت هیچ کامیان شێخ زادە بانوو نین، بەڵکو هاودەمە تایبەتیەکان یا مریدە نزیکەکانی‌و خەڵکی هەمان ئەو گوندە یا گوندەکانی دەوروبەر بوون‌و زیاترین وەختی خۆیان بۆ دەرکی فەیزو شکۆمەندی لە حزوری مرادی خۆیان بەسەر دەبرد. کەمێك دواتر، ژنێکی پەردەدار پەردەی ژوورەکەی بەرزکردەوەو شێخ زادە بانووی بە بانگهەڵدانی سەلام‌و سەڵەوات

هێنایە نێو کۆڕی دانیشتنی ئێمەوە. هەمووان لە جێی خۆیان هەستانە سەرپێ‌و منیش هەستام. شێخ زادە بانوو کە ئافرەتێکی بالآ ناوەندی‌و کەمێك قەڵەو بوو هێشتا تیشکی خۆری جوانیی سەردەمی گەنجێتیی لەسەر لێوی بانی تەمەنیدا بریسکەی دەداو تەسبیحێکی دانە وردی بە گەردنیدا هەڵواسیبوو چارۆگەیەکی پڕ ڕەنگی خستبووە سەری. کە هاتە ژوور بۆ لای من هات‌و بە گرتنەوەی چارۆگەکەی ڕوومەتی منی ماچ کرد. منیش داهاتمەوەو دەستیم ماچ کردو ئەو بە گرانی ڕێگەی دەست ماچکردنەکەی پێدام. "دانیشتین‌و دوای ئەوەی کە ئەو ماوەیەك دوعاو نزای خوێندو چاك‌و چۆنیە ئاساییەکان کۆتاییان هات، یەکەمین پرسیاری لە من ئەوە بوو کە ئایا من هەمان محەممەدی کوڕی خوالێخۆشبوو میرزا عەبدولخالقی ئیمام جومعەم، و تا ئێستا لە کوێ بووم‌و چیم دەکرد. ئەو دوودڵی‌و گومانەی ئەوم لا سەیر بوو. وەڵامیم دایەوەو بە کورتی گوتم کە ماوەیەك لە گوندەکانی ناوچەی فەیزوڵلابەگی لەلای دایکم بووم‌و ماوەیەکیش لە ماڵی قازی گەورە بووم لە مهابادو دەچوومە قوتابخانە.

"پرسی: چی بووە کە هاتوویتە ماڵی شێخ ئەحمەدی مامت لە سریلاوا؟

"هیچ وەڵامم پێنەدرایەوە، ڕاستیەکەی خۆشم نەمدەزانی بۆچی لە ماڵی قازی گەورە ڕا هاتبوومە سریلاوا. لە ڕاستیشدا من هەوەڵ جار بڕیار نەبوو لە سریلاوا بمێنمەوە، بەڵام ماموژنەکانم هانیان دام کە بمێنمەوە. بێدەنگ سەرم لەبەر خۆم نابووەوەو دڵشکاو دەهاتمە بەرچاو. ئەوکە وەڵامێکی لێ نەبیستم، پرسیارەکەی خۆی دووبارە کردەوە. دوای کەمێك بێدەنگی گوتم: نازانم، هەروا هاتووم.

"زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانەی کە بەسەر لێوانیەوە بوو بینیم، گوتی:

"بەلام من باش دەزانم کە بۆچی هاتوویت. تۆ پێتوایە کە لە میراتی باوکی خوالێخۆشبووت شتێك لای کوڕەکەی منەو بە خەیاڵی خۆتەوە هاتوویت کە داوای ماڵو میرات بکەیت. دیارە قازیەکان لە مهاباد هانیان داویتو ڕەوانەی ئێرەیان کردوویت، بەلام هەم تۆ خراپت خوێندۆتەوەو هەم ئەوانیش. باوکی تۆ هیچی نەبوو کە کوڕەکەی من خواردبێتی، مەزرایەکی بەناوی مەزرای (خەزایی) لە نزیکی شارەوە هەبوو کە گوایە ئێستا بەدەست یەکێك لەو قازیانەیە و ژمارەیەك مانگاو مەڕیش کە خاوەن قەرزەکان لە جیاتی قەرزی خۆیان بردیانن، تازە ئەو شتانە قەرزەکانیشیان هەموو پێنەدرانەوە. ئێستا چەند ساڵە کە کوڕەکەی من لە ڕێی خوا خوشکەکەت بەخێو دەکاتو کەسێکیش نییە پێی بڵێ: "خوا خێرت بنووسێ". من نازانم ئەو قەومو خیشانە چیان لە گیانی ئەو دەوێو بۆچی دەستی لێ هەڵناگرن. ئەو خۆ کاری بە کاری ئەوانەوە نییە و هەر کاتێك کە دەچێتە مهاباد مایەی دەردی سەری ئەوان نییە (هەرچەند من دەزانم کە دەبوو مایەی دەردی سەریان)."

"ئاوا لەسەر یەك بۆڵەبۆڵی بوو و قسەی دەکرد، وەلێ من شتێکی ئەوتۆ لە قسەکانی تێنەدەگەیشتمو هەر ئەوەندە بوو هەستم دەکرد کە خەریکە هەڕەشە لە من دەکاو باسی میراتو میراتکاری باوکم لە گۆڕێیە. ئەوەندە نیگەران ببووم دەتگوت دنیایان بەسەردا ڕووخاندووم. تەنانەت یەك وشە چیە لەو تۆمەتە ناڕەوایانەی کە شێخ زادە بانوو، شێخی گەورەی ژنانی کوردو مورشیدو مرادی ئاینیو ئەخلاقی نیوەی دانیشتوانی ئەو هەرێمە، دژی منو گەورەپیاوانی قازیەکان لە دەمی دەردەچوو، بە مێشکی هیچ یەك لە ئێمەدا نەهاتبوو. قوڵپی گریان توند قوڕگی گرتبووم، گریانم دەهاتو

نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە. زۆری نەمابوو هەستم و ڕابکەم. ئاخر ئەمە ج ڕەفتارێك بوو ئەو ژنە مورشیدە، ئەو بەناو دایە گەورەیە، ئەو زڕدایکەی باوکم، دەرهەقی منی بێچارە دەیکرد؟ من جگە لەوەی بۆ ئەوەی کە ئەو باسی دەکرد نەهاتبووم هەر عەقڵیشم ئەو شتانەی پڕنەدەکردو تەنها شتێك کە هەرگیز بیرم لێنەکردبووەوە میراتی باوکم بوو.

"ئەو خوانچە نان‌و چای‌و کەرەو مرەبایەی کە لە پێشیان دانابووم، دەست لێنەدراو گەڕایەوە. ئەوەندە دڵم پڕبوو کەم گێزی خواردنی هیچ شتێکم نەبووشەو قوڵپەی کە لە قورگمدا گیر بوو، نەیدەهێشت پاروووم لە دەم بچێتە خوار. ژنەکانی تر هەوڵیان دا بە قسەی خۆش‌و دەربڕینی خۆشەویستی شوێنەواری قسە تاڵ‌و ناخۆشەکانی شێخ زادە بانوو بڕەوێننەوە. یەکێك دەیگوت: "چاوەکانی چەندە زیندوو بێگەردن ! دەڵێی چاوەکانی باوکی خوالێخۆشبووین" یەکێکی تریان دەیگوت: "نێوچاوانی ساف تەواو وەکو نێوچاوانی دایکیەتی" بەڵام من سەرم لەبەر خۆم نابوو و خوا خوام بوو هەرچی زووترەو ئیزنم بدەن‌و بڕۆم. بۆ ساتێك شێخ زادە بانووم غافڵ کرد کە زەق‌و زەق لێم نز ببوەوە. دیسان سەرم نەوی کردەوەو چیتر تەماشام نەکرد، بەڵام هەستم دەکرد کە دەموچاوم خەریکە لە بروسکەی نیگاکانی ئەودا دەسووتێ. تەنها ئەوکاتەی هەستم بە کەمێك ئارامی کرد کە شێخ زادە بانوو هەستاو بۆ نوێژی ئێوارە ڕابوو و کەوتە سوجدەوە. سوننیەکان دەبێ نوێژەکان لە کاتی دیاریکراوی خۆیاندا بکەن، ئەگەر لە کاتی خۆی تێپەڕین دەبێ قەزا بکرێنەوە. کاتژمێرێك زیاتر لەسەر بەرماڵ بوو خەریکی کڕنۆش بردن‌و تاعەت بوو. تەنانەت لەو دەمەشدا زیاتر چاوە بڵێسەدارەکانی وەکو چاوی هەڵۆیەك کە بە دوای

شکارەوە بێ لە چاوە تاساوەکانی من جیانەدەبوونەوە. ویستم هەستم‌و لاسارانە لێیبدەم بڕۆم، بەڵام نەیانهێشت‌و گوتیان شێخ زادە بانوو فەرمووبەتی تا سبەی بەیانی کە بۆ سرپلاوا دەگەڕێمەوە دەبێ میوانی حەرەم بم، بە تایبەت کە لە خانووەکەی دەرەوە کەسێك نەبوو تا لەگەڵیدا دابنیشم تەنها مامە شێخ بوو کە ئەویش چووبووە سرپلاوە.

"کاتی نان خواردنی ئێوارە، ئەو خاوەن ماڵە دڵڕەقەی من، گوایا بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو ڕووبەڕووبوونەوە توندەی دەیەوێ نەرمی نیشان بداو خۆی خواردنی بۆ لە قاپ دەکردم. دوای نانخواردن، ئەمجارەیان بە شێوازێکی تر پرسیارپێچی کردم‌و لێی پرسیم ئایا بنەماکانی دین‌و ڕێ‌و شوێنەکانی دەزانم، ئایا نوێژکردن دەزانم، ڕۆژوو دەگرم، یا هیچم لە قورئان خوێندووە؟ گوتم هەمووان دەڵێن هێشتا من تەمەنم بچوکە و نوێژو ڕۆژووم لەسەر نییەو قورئانیش هەر ئەوەندە دەزانم کە لە قوتابخانە خوێندوومە، بە تایبەت (سورەتی یاسین) بە باشی دەتوانم بخوێنم. جەختی کردەوە کە نوێژو ڕۆژوو و لەبەرچاوگرتنی داب‌و ڕێو شوێنە ئایینیەکان بە تایبەتی فێربوونی قورئان، تەنانەت لەم تەمەنەشدا پێویستن، نە خاسمە بۆ من کە کوڕی ئیمام جومعەم‌و نەوەو تۆرەمەی خاوەن ئیجتیهادەکانی قەوم‌و قیلەم.

"شەو ڕاکشابوو کە ئیزنیان دام بچمە ئەو ژوورەی بۆ خەوتنی من دیاریکرابوو. پیرەژنێکی ڕووخۆش‌و میهرەبان کە خزمەتکاری حەرەم‌و بە تایبەت هی شێخ زادە بانوو بوو منی بۆ ئەو ژوورە ڕێنوێنی کرد. ئەو ژنە کە ناوی (خات عایشە) بوو، تا بڵێی ژنێکی باش‌و میهرەبان بوو. بەرلەوەی جێم بۆ ڕابخا چەندین جار سەرو ڕوومەتی ماچ کردم‌و خۆی بە قوربان‌و

سەدەقەم کردو بە حەسرەتەوە باسی ئەو چاکە و میهرەبانیانەی باوکم دەرهەق بە ئەوو مێردەکەی دەکردو چەندین دەسکەچیلەی نوورو ڕۆشنایی بۆ گۆڕی باوکم ڕەوانە کرد. لە دوا قسەکانیدا دیسان منی ماچ کردو شەوباشی لێکردمو ڕۆیشت.

"من گەرچی زۆر ماندوو و شەکەت بووم ئەوەندە تووشی خەیاڵاتی تێکەڵو پێکەڵو پەرێشان ببووم کە ماوەیەك لەسەر جێدا گینگڵم دەداو خەوم زڕابوو، ئێستاش نازانم کەی خەوم لێکەوتبوو.

"نزیکەی بەرەبەری مەلابانگدان بوو کە هێشتا تاریك بوو و ئەستێرە بە ئاسمانەوە بوون، یەکێك بە پرتاویو شڵەژاوییەوە لە خەوی هەستاندم. لەبەر ڕۆشنایی ئەو فانۆسەی کە لە دەستی خات عایشە بوو ناسیمەوەو پرسیم بۆچی بەو سبەینە زووە بانگم دەکا. ئەو لە جیاتی وەڵام فەرمانی پێدام هەرچی زووە جلەکانم دەبەرکەمەوە و بێ سەرو سەدا بە دوای بکەوم. دڵم داخورپاو بێ سێو دوو کەوتمە دوای. خۆیشی لە جل پۆشینمدا یارمەتی دام. کە ئامادە بووم چرایەکەی کوژاندەوە، دەستی گرتمو بە هێواشی لە پلیکانەکان بردمیە خوار. لە حەوشەش لەژێر درەختەکاندا منی بە دوای خۆیدا ڕاکێشا و پەیتا پەیتاش جەختی دەکردەوە کە دەنگم هەڵنەبڕم. بە ڕاستیش ترسابوومو نەمدەزانی مەسەلەکە چیەو چی ڕوویداوە.

"دوای تێپەڕین لە حەوشەی حەرەمو گەیشتنمان بە کۆڵانی باغی ئاڵوباڵوەکان، خات عایشە ماچی کردمو دەستی منی خستە نێو دەستی لاوێك کە لەوێ لە چاوەڕوانی ئێمەدا ڕاوەستابوو و دیسان جەختی لێکردەوە کە تا زووە بمگەیەنێتە شوێنی مەبەست، شوێنێك کە من نەمدەزانی کوێیە.

لاوەکە دەستی گرتم‌و خێرا بە دوای خۆیدا ڕایکێشام تا لە ماڵی شێخ زادە بانوو واتە لە حەرەم چووینە دەرەوە.

"ئیدی گەیشتبووینە نێو گوندەوە. لاوەکە کەمێك خێرایی کەم کردەوە بەلام لێك لێکە جەختی دەکردەوە کە قسە نەکەم‌و پێ بە پێی ئەو بڕۆم. بە کۆلانێکی سەرهەورازیدا هەلگەڕاین. چەند سەگێك دەوەڕین بەلام لاوەکە گوێی بە وەڕینی سەگەکان نەدەداو هەروا منی بە دوای خۆیدا دەکێشا. هەوا هێشتا هەر تاریك بوو. لە پێچی کۆلانێك کە کەوتبووە لای سەرەوە لە بەردەم ماڵێك ڕاوەستاو لە دەرگای دا. هیچ وەلامێك نەدرایەوە. ئەوەندە لە دەرگەی دا تا سەرەنجام دەنگێك لە ژوورەوە هات‌و پرسی کێیە؟

"ئیسماعیلم، کوڕی خات عایشە، زوو دەرگە بکەنەوە کارێکی پێویستم هەیە.

"پیاوێك‌و ژنێك پێکەوە هاتنە دەرەوە، بە دڵەڕاوکێوە دەرگەیان کردەوە. ئیسماعیل منی لەگەڵ خۆیدا بردە حەوشەو پێی گوتن دەرگە پێوە بدەنەوە.

"هەر چوارمان چووینە ژوورەوە. کووخێکی بچوك‌و تاریك‌و دووکەلاوی بوو و تەنها چرا قەندیلەیەکی بە کزی کە نازانم بە ڕۆنی گەرچەك یا زەیتێکی تر بوو دایسا. دوای چاك‌و چۆنیەکان دەرکەوت کابرای خاوەن ماڵ "حەسەن بەگ" یەکێکە لە وردە خاوەن مولکەکانی پالاوا کە بەرژەوەندییەکی کەمی لەو گوندە هەیە و ژنەکەی کە ناوی (عیسمەت خانم)ە زڕ پووری منە. من تا ئەوکات نەمبیستبوو کە زڕ پلکێکم بە ناوی عیسمەت خانم لە گوندی پالاوا ژنی مولکدارێك بێت، هەیە. ئیسماعیل لە زاری خات عایشە بۆی باسکردن کە لە لایەن شێخ زادە بانووەوە ڕاسپێدراوە

بەرەبەری بەیانی منداڵەکە (واتە من) لە کۆڵ بکاتەوە، یانی ژەهرم بۆ لەنێو شیر بکاتو لە نێوم ببات تا جارێکی تر باسی میراتو میراتکاری باوکم نەکەم. ئیسماعیل بۆی باس دەکردنو گوتی دایکم گوتی خوا چۆن قبوڵ دەکات کە منداڵێکی بێ گوناهی ئاوا بکوژرێ. ئامادە نەبوو ئەو تاوانە گەورەیە ئەنجام بدات بۆیە وا لە مەترسیەکەی دەربازی کردووەو ڕەوانەی ئێرەی کردووە کە ئێوە تا زووە بیگەیەننە شوێنێکی هێمنو بێ مەترسی، ئەم کوڕەش خوشکەزای ئێوە و یەتیمو سێویە.

"کە ئەو قسانەم بیست بڕبڕەی پشتم لەرزیو بە تەواوی تاسام. وام هەست کرد وەك بەرخێك وام کە گورگێکی دڕندە بۆی لە کەمیندایەو ئێستا بە هەوڵی شوانێکی وریا بە شێوەیەکی کاتی ڕزگاریم بووە. دڵم بە بێکەسیو بێگوناهی خۆم دەسووتا، ئاخر بە ڕاستی من هەرگیز بۆ میراتو داواکردنی میرات نەهاتبوومو بە هەومنتە دەکوژرام. پوورە نەناسراوو نەدیتووەکەم چەندین جار ماچی کردم لە ئامێزی خۆی گرتمو گریاو منیشی هێنایە گریان. حەسەن بەگ تەنها جنێوی دەداو دەیگوت ئەو نوێژو ڕۆژو و بەرماڵە بیگرێ، داواو بانگەشەی ئیرشادو ڕوحانیەت دەکات، بەڵام لە شەیتان مەلعون ترە. پوورم کە خۆیشی یەکێك لە موریدەکانی شێخ زادە بانوو بوو ئەو دڵڕەقیەی لەو باوەڕ نەدەکردو نەشیدەتوانی بە درۆی بخاتەوە.

"ئێستا قسە لەسەر ئەوە بوو بۆ کوێم ببەن. ئیدی گەڕاندنەوەی من بۆ سریلاوا بە باش نەدەزانرا، چونکە ئەویش کەم تا زۆر لەژێر قەڵەمڕەوو دەسەڵاتی شێخ زادە بانوودا بوو. ڕێگای مهاباد دوورو درێژ بوو و پێویستی بە کاتو پێداویستی تر هەبوو کە حەسەن بەگ بۆی جێبەجێ نەدەکرا،

بۆیە باشترین ڕێگاچارە کە هەڵیانبژارد ئەوە بوو بمگەیەننە گوندی (پیروەلی باغ) کە نزیکتر بوو و بە قازی عەسکەرم بسپێرم کە کوڕە مامی باوکم‌و برای قازی گەورە بوو تا ئەو ڕێ‌و شوێنی گەڕانەوەم بۆ مهاباد دابین بکات.

"ئیدی نەدەبوا ماتەڵ بین. حەسەن بەگ هەستاو خۆی ئامادە کردو ئەوەشی بە ئیسماعیل ڕاگەیاند کە سەبارەت بە سەفەرە کورتەکەی بۆ پیروەلی باغ کەس ئاگادار نەکاتەوە. وایان بڕیار دابوو کە لە حەرەمیشدا وا بڵاو بکەنەوە کە منداڵەکە نیوەشەو خۆی لە خەو هەستاوەو لێیداوە ڕۆیشتووە.

"نزیکەی کاتژمێر نۆی بەیانی بوو کە گەیشتینە پیروەلی باغ‌و یەکسەر چووینە ماڵی قازی. قازی عەسکەر لە تەویلەی ئەسپان ڕاوەستابوو و سەیری مەیتەرەکەی خۆی دەکرد کە خەریکی خوراندنی یەکێك لە ئەسپە ڕەسەنەکانی ئەو بوو. هەر کە ئێمەی بینی بۆ لای حەسەن بەگ هات‌و پێکەنی. چاکوچۆنی لەگەڵ حەسەن بەگ کردو ئینجا ڕووی لە من کردو پرسی ها دیسان کاڵەکت دزیوە؟ (ئاماژەیە بە ڕووداوێکی تر کە پەیوەندی بە قازی عەسکەری خوالێخۆشبووەوە هەیە کە لە کتێبی "بیرەوەریەکانی وەرگێڕێك"دا هاتووە)- من لە شەرمان سەرم داخست‌و هیچم نەگوت.

"حەسەن بەگ، قازی عەسکەری بۆ لایەك بردو ڕووداوەکەی بە گوێدا چرپاند. بینیم ڕەنگی قازی سوورهەڵگەڕاو لەژێر لێوەوە شتێکی گوت‌و جنێوی دەدا. حەسەن بەگ هەرچەند قازی زۆر خولقی کرد بمێنێتەوە، کەچی بۆ یالاوا گەڕایەوە. منی نارده ژووری دەرەوە تا هەرکاتێك کاروانێك بۆ بردنی دانەوێڵە بۆ مهاباد ئامادە بوو لەگەڵ ئەواندا بمنێرێتەوە ئەوێ.

"نزیکەی سێ مانگی درێژە کێشا تا کاروانێك پەیدابوو. ئەو سێ مانگەی نیشتەجێبوونە زۆرەملێیە لە پیروەلی باغ بەخۆشترین ڕۆژەکانی سەردەمی منداڵی من دەژمێردرێن. زۆر بیرەوەریی خۆشم لەو ڕۆژانە هەن کە باسکردنیان لێرە دەبێتە مایەی درێژدادڕی. شەوو ڕۆژ نانم لەگەڵ ئاغاو ئاغاژن لە ژووری ناوەوە دەخواردو شەوانیش لە ژووری دەرەوە دەخەوتم. چونکە ئەوان منداڵیان نەبوو پێیان خۆش بوو من بکەنە منداڵی خۆیان، بەڵام قازی عەسکەر وای پێ باش بوو لە جیاتی مانەوەم لە گوندو ڕووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ چارەنووسێکی نادیار، بچمەوە مهابادو درێژە بە خوێندنم بدەم.

"سەرەنجام، شەوێك لە شەوەکانی نێوەڕاستی پاییز کە هەوا زۆر سارد بوو، کاروانێك کە گەنمی بار کردبوو بەرەو مهاباد وەڕێکەوت. قازی عەسکەر نامەیەکی بۆ قازی گەورەی برای نووسیو منی بە نامەکەوە بە کاروانسالار سپارد تا لە دادگای قازی گەورە تەسلیمی ئەوانم بکات. تیشکی خۆر هەڵکشابوو کە گەیشتینە مهابادو کاروانسالار دوای داگرتنی بارەکان لە کاروانسەرا، منی بردە بارەگای قازی گەورەو لەگەڵ نامەکە تەسلیمی ئەوانی کردم..".

ئەمە بوو بیرەوەرییەکی سەردەمی منداڵیم کە وێڕای شیرینی ناخۆشیش بوو لە کتێبی "بیرەوەریەکانی وەرگێڕێك"دا کە بە داخەوە جارێ ئومێدی چاپبوونی نییە، ئەو جۆرە بیرەوەریانە کەم نین.

پ: ئایا لە بنەماڵەی ئێوەدا کەسێك ئەهلی قەڵەم بووە؟ دوای مردنی باوکت چیت کرد؟

و: ئێوە، ساڵحی هێژا، بەو پرسیارەتان یەکێك لە شیعرە بەرزەکانی (سەعدی)تان هێنامەوە بیر کە دەفەرموێ:

(هەموو خێڵی من زانای ئایین بوون

من مامۆستای ئەڤینی تۆ فێری شاعیری کردم)

بەڵێ زۆربەی کەسە ناسراوەکانی ماڵباتی ئێمە مەلاو موجتەهیدو زانای ئایینی بوونو ڕۆژگاریان بە داوەریکردن لە دادگای شەرعو وانە وتنەوە لە حوجرەو مزگەوتەکان دەبردە سەر، بەلام ئەهلی قەڵەم بە مانای نووسەرو وەرگێڕمان زۆر نینو من تەنها دەتوانم ناوی چەند کەسێکیان بێنم:

١-خوالێخۆشبوو (قازی فەتاح) کە دەڵێن شاعیرێکی لێهاتوو بووەو لە سەردەمی داگیرکردنی وڵات لە لایەن داگیرکەران لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی کوژراوە. ئەو پیاوە یەکێك لە خەباتگێڕانی سەرسەختی ئازادیی گەلی کورد بوو، کەم تا زۆرێك شیعری ئەو ناودارە لە یادەوەری خەڵکدا ماون، بەلام بە داخەوە دیوانێکی چاپکراوو نووسراوی نییە.

٢-(شێخ ئەحمەد)ی مامی خۆم کە زەوقێکی جوانی هەبووە لە هۆنینەوەی شیعری کوردیدا، بە داخەوە ئەویش تەنها تاكو تەرا شیعری لە یادەوەرییەکانی خەڵکدا لە پاش بەجێ ماونو بەرهەمێکی لە دوای خۆی جێنەهێشتووە.

٣-(میرزا ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات) باوکی خەباتگێڕی ناودار (حوسێنی سەیفی قازی) کە لەگەڵ شادڕەوانان (قازی محەمەد) و (سەدری قازی) لە ١٩٤٧ بە تاوانی خەبات لە ڕێی میللەتی کورددا بە فەرمانی شای پێشوو لە سێدارە دران.

(سەیفولقوزات) یەکێکە لە شاعیرانی ناوداری کورد کە خۆشبەختانە دیوانە شیعرەکەی لەم دواییانەدا واتە لە مانگی ١٩٨٢/١٠ بە هەوڵی ئەدیبی بەرجەستەو شاعیری زمان پاراو بەڕێز (ئەحمەدی قازی)، چاپکراوە. سەیفولقوزات پیاوێکی مەزن‌و خۆش مەشرەب‌و ئەدیب بوو و هەندێ جار شیعری فارسیشی وتووە.

٤-بەڕێز (ئەحمەدی قازی) شاعیرو ناودارو وەرگێڕی بلیمەت کە ئێستا لە تاران دادەنیشێ‌و یەکێك لە وەرگێڕە باشەکانی وڵاتە کە کتێبەکانی "شەوی بێ پایان" و "جمکە سەیرەکان" و "ئەوەی ئەژدیها"ی لە زمانی ئینگلیزیەوە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی فارسی‌و چاپ کراون‌و کتێبی "ژانی گەل"یشی بە هاوکاری لەگەڵ من لە کوردیەوە کردۆتە فارسی. کتێبێکی تریشی لە ژێر ناوی "خوای ئێوە زۆر سپیە" لەژێر چاپدایەو هیوادارم بە زوویی بڵاوبکرێتەوە.

کاك ئەحمەدی قازی یەکێك لە شاعیرانی بەرجەستەیە لە زمانی کوردی کە من ئومێدەوارم بتوانم شیعرە جوانەکانی ئەو بکەمە فارسی‌و وشە جوانەکانی بگەیەنمە گوێی فارسی زمانەکانیش.

بەڵام سەبارەت بەوەی کە پرسیوتە دوای باوکم چیم کرد، وەك پێشتریش ڕامگەیاند من زۆر بچوك بووم کە باوکم کۆچی دوایی کردو لە ڕاستیدا ژیانی من دوای مردنی باوکم دەستپێدەکات.

پ: دوای ئەوەی کە هاتیتە تاران، ئایندەی خۆت چۆن دەبینی؟

و: گومانی تیا نییە کە بە ئومێدی ئایندەیەکی گەش هاتمە تاران. ساڵی ١٩٢٨ کە لە مهاباد بڕوانامەی شەشی سەرەتاییم وەرگرت لەبەرئەوەی ئەوکات هێشتا لە مهاباد خوێندنگەی ناوەندی نەبوو بێ کار مامەوەو

هەموو هیواو ئاواتم ئەوە بوو کە خۆم بگەیەنمە لای مام دکتۆر (جەوادی قازی) لە تاران‌و لەژێر چاودێری‌و بە هەوڵی ئەو درێژە بە خوێندنی ئامادەیی‌و زانکۆم بدەم‌و بۆ خۆم ببمە کەسێك.

ساڵی ١٩٢٨! تازە مامم لە ئەڵمانیا گەڕابووەوە ئێران‌و گوازرابووەوە بۆ تاران‌و لە دادگا وەك دادوەر لە بەشی دادگای لێکۆڵینەوە دامەزرابوو.

لە مهاباد لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەوە پێشنیاز کرابوو کە بە مانگانەیەکی پازدە تومانی لە گوندی (کەلیڕەزاخان)دا ببمە مامۆستا. بە ڕای زۆر خزم‌و برادەران دەرفەتێکی باش بوو کە قبوڵی بکەم، چونکە ئەوکات هەم پازدە تومان مووچەیەکی باش بوو و بۆ لاوێکی سەڵتی وەکو من زیاد بوو کەم نەبوو، هەمیش کاری مامۆستایەتی بە بەراورد لەگەڵ بێکاریی کۆمەڵێکی زۆر لە لاوان‌و لەگەڵ کرێکاری ڕۆژانەو کاسبکاری‌و ئیشی مەزرا بە کارێکی پوختە و باش لێکدەدرایەوە، بەڵام من بە ئومێدی مامە گیانم کە تازە لە تاران ژنی هێنابوو و ماڵ‌و حاڵێکی باشی پێکەوە نابوو، ئامادە نەبووم ئەو پێشنیازە قبوڵ بکەم‌و ببمە مامۆستا، نامە لەسەر نامەم بۆ مامم دەنووسی‌و وازم لێنەدەهێناو داوام لێیدەکرد بمباتە لای خۆی. مامم وەڵامی من‌و نامەکانی منی نەدەدایەوە بەڵام دیاربوو بۆ قازی گەورەی نووسیبوو کە منی بۆ بنێرێ. باسی ئەو ڕووداوەش درێژەو من ئەوەندە لەسەر داوای خۆم پێمداگرت تا دواجار لە تەمووزی ساڵی ١٩٢٩ منیان لە هەلومەرجێکی ناخۆش کە باسکردنی جێی داخە بۆ تاران بەڕێ کرد.

لە ماوەی نێوان تەواوکردنی تاقیکردنەوەکانی شەشی سەرەتایی لە ١٩٢٨/٣ و بە ڕێکەوتم بۆ تاران لە ١٩٢٩/٧ بە جۆرێکی تر سوودم لە کات وەرگرت: کوڕە لاوێك لە کوردە دڵسۆزەکانی (عێراق) بە ناوی

(عەبدولڕەحمان گیو) کە تازە لە عێراق هاتبووە مهابادو لەو شارە نیشتەجێ بووبوو، ڕایگەیاند کە هەرکەس بیەوێ بە دانی مانگانەیەکی پێنج تومانی بەشداری بکات لە خولی وێنەگری یا گرافەر سازی یا پیتچنی یاخود فێربوونی زمانی فەرەنسی دەتوانێ ناوی خۆی بنووسێ. تاکە کەسێك کە بۆ فێربوونی زمانی فەرەنسی ئامادە بوو من بووم، بەڵام پارەم نەبوو کە مانگی پێنج تومان بدەم، بۆیە گرفتەکەم لەگەڵدا باسکرد، ئەو بەوپەڕی جوامێرییەوە قبوڵی کرد کە بە بێ پارە دەرس بە من بڵێ. لە ساڵێك کە لای ئەو دوو کتێبی سەرەتایی فەرەنسیم تەواوکردن، بناغەیەکم دانا بۆ درێژەدان بە خوێندن لەو زمانەداو ئارەزووی وەرگێڕانیشم هەر لەو کاتە لەلا پەیدابوو، بە چەشنێك کە دەتوانم بڵێم سەرکەوتنێك کە لەو ڕێیەدا وەدەستم هێناوە، ئەگەر بکرێ بە سەرکەوتنی ناوبنێین، ئەوە لە پای هەوڵ و کۆشش و خۆشەویستیی ئەو بەرێزەیەو من بە ڕاستی قەرزاری گیوی بەرێزم، ڕەوانی شاد بێت!

دوای سەرکەوتنم بۆ هاتنە تاران و ناونووسیم لە ئامادەیی خانەی هونەر، بەو منداڵیەشمەوە دڵم ڕوون بوو کە ئاییندەیەکی خراپم نابێ و من ئەمڕۆ کە خۆم لە ڕووی ماددی تا ڕادەیەکی باش بێ نیاز دەبینم و لە ڕووی مەعنەویشەوە مایەی ڕێزو ستایشی هەموو ئەو کەسانەم کە چ دەمناسن و چ لە ڕێی خوێندنەوەو ئاشنایی لەگەڵ فەرهەنگ و لە ڕێی کتێبەوە ناوی منیشیان کەوتۆتە بەرگوێ خۆم بە مرۆڤێکی بەختەوەر دەبینم، بۆیە هەڵەم نەکرد کە بە ئومێدی ئاییندەیەکی گەشتر لە مامۆستایەتی لە گوندی (کەلبرەزاخان) خۆم گەیاندە تاران و لەو میانەشدا بەرگەی زۆر دەردەسەری و خەفەت و کوێرەوەریم گرت کە لە کتێبی (بیرەوەرییەکانی

وەرگێڕێك)دا باسم کردووە. لێرە بۆ کۆتایی هێنان بە وەڵامی ئەو پرسیارە، ئەوە دەڵێم کە چارەنووسی خۆم تا ڕادەیەك لە شێوەی چارەنووسی (ماسیە ڕەشە بچکۆلە) دەبینم کە ئەویش بە مەلەکردن لە ڕووبارێکی بچوك دڵی ئاوی نەخواردەوەو ڕێگای دەریای گرتەبەر.

پ: باشە، ئێستا وەك یەکەمین پرسیار لە بواری وەرگێڕانەوە، چ جۆرە کتێبێك هەڵدەبژێری‌و بڕیاری وەرگێڕانی دەدەیت؟

و: من زیاتر شەیدای وەرگێڕانی ڕۆمانە کۆمەڵایەتیەکانم‌و نووسینی تری وەك بابەتی مێژوویی یا فەلسەفی یا ئاینی یا زانستی لە سنوری دەسەڵاتی خۆم بەدەر دەبینم. لەگەڵ ئەوەشدا لەنێو نزیکەی شەست بەرهەمی گەورە و بچوك کە تا هەنووکە لە لایەن منەوە وەرگێڕدراون‌و خراونەتە بازاڕەوە بەرهەمێکی مێژوویی وەك "ناپلیۆن"، زانستی وەك "تێڕوانینێك بە سروشت‌و نهێنیەکانی" بەرهەمی پرۆفیسۆر (لیۆن بەرتۆن) و "زەوی‌و کات" بەرهەمی "نا. وۆلکۆف"، و بابەتی فەلسەفی – ئاینی وەك "دەربارەی چەمکی ئینجیلەکان" بەرچاو دەکەون.

ڕۆمانیش وەك خۆت دەزانی دوو جۆرە، یەکەم ئەو ڕۆمانانەی کە تەواو سەرگەرمکەرانەن‌و لایەنی پەروەردەییان نییە، و زۆربەی ڕۆماننووسەکانی وەکو (ئەلکساندەر دوما) و کەسانی لەو شێوە لە زمانی فەرەنسیدا لەو چەشنە ڕۆمانانەن، دووەم ئەو ڕۆمانانەی کە لایەنی پەروەردەییان بەسەر لایەنی سەرگەرمکردنندا زاڵە و من هەمیشە خوازیاری وەرگێڕانی ئەو جۆرە بەرهەمانەم. بە شێوەیەکی گشتی ئەو هێڵە دیاریکراوەی کە من لە کاری وەرگێڕاندا بۆ خۆم هەڵمبژاردووەو بۆتە مایەی ئەوەی کە لە بەرامبەر خوێنەرانی بەرهەمەکانمدا بە وەرگێڕێکی مولتەزیم‌و پابەند بناسرێم

ئەوەیە کە نووسەری مایەی پەسەند و قبوڵی من کەسێک بێت لایەنگری ئازادیی بیروڕامان‌و دەربڕین‌و داکۆکیکەری مافی زەحمەتکێشان‌و ستەمدیوەکان‌و برەوپێدەری بنەماکانی شەرەف‌و مرۆڤایەتی‌و جوامێری، بە کورتی مرۆڤێک بێت واقیعبین‌و واقیعگەراو دوور بێت لە بیروباوەڕی پووچ‌و خوراق. تا ئێستا بە دەگمەن وا ڕێک کەوتووە کە من بەرهەمێک وەربگێڕم‌و خوێنەرە هۆشیارو مرۆڤدۆست‌و ئازادیخوازەکان پەسندیان نەکردبێت.

لەسەر بنەمای ئەو پێوەرانەی کە باسم کردن تا خۆم کتێبێک پەسند نەکەم، جا خۆم کڕیبێتم یا بڵاوکەرەوەکان بیانخستبێتە بەر دەستم، ئامادە نابم وەریبگێڕم‌و لەو بارەیەوە هەقدەستی وەرگێڕان بۆ من هەمیشە بە پلەی دووەم گرنگی هەبووە. من لە میانی وەڵامدانەوەی پرسیارێکی بەڕێزتان کە پێشتر خرابووە ڕوو، مەسەلەی بانگهێشتنی ڕۆژنامەی (کەیهان) و پێشنیازی وەرگێڕانی "کاتژمێری بیست‌و پێنج"م گێڕایەوەو باوەڕ بفەرموو کە لە ماوەی تەمەنی وەرگێڕانی خۆمدا نەوەدو پێنج لە سەدی کارەکانم بە پێی ئەو پێوانەیەوە بووە کە بۆم باسکردی.

ئەنجامی ئەو جەشنە کارکردنە، بێ ئەوەی بە ڕاستی مەبەستی خۆپەسنی‌و خۆهەڵکێشانم هەبێ ئەوە بووە کە زۆر لە خوێنەرانم‌و بە پشتڕاستکردنەوەی قسەی ئەوان زۆر لە بڵاوکەرەوەکانیش پێیان گوتووم‌و دیسانیش دەڵێن کە زۆرجار کڕیارەکانی کتێب خوازیاری وەرگێڕانەکانی (محەمەدی قازی) بوونە بێ ئەوەی کاریان بە ناوی نووسەری کتێبەکەوە هەبووبێ، و کە پرسیاری هۆی ئەمەیان لێکراوە، لە وەڵامدا وتوویانە:

"چونکە دەزانین کە ناوبراو کتێبی خراپو بێسوود وەرناگێڕێ!"، بە ڕای تۆ چ سەرکەوتنێك لەمە مەزنترە؟

پ: لە هەڵبژاردنی کتێبدا، بۆ وەرگێڕان، چۆن ڕووبەڕووی کێشەی سانسۆر دەبوویتەوە؟

و: ئەم پرسیارە زیاتر پەیوەندی بە بڵاوکەرەوەکانەوە هەیە تا بە نووسەرو وەرگێڕەکان چونکە نووسەرو وەرگێڕ هەر ئەوەندەیان لە سەرە کتێب ئامادە بکەن‌و بیدەنە دەستی بڵاوکەرەوە، و دوای ئەوە بڵاوکەرەوەیە کە سەروکاری لەگەڵ چاپخانەو بەرگگرو بازاری کاغەزو لە هەمووشیان خراپتر لەگەڵ سانسۆرو سانسۆرچیدا هەیە. لە لایەکیش بەڵای سانسۆر هەمەگیرەو یەخەی بڵاوکەرەوەو نووسەر پێکەوە دەگرێ، چونکە هەردووکیان زیان لە دەستی ئەو بەڵایە دەبینن‌و ڕەنج‌و ماندووبوونیان بە خەسار دەچێ. بەڵام چی بکەین؟ تا ئەو کاتەی لە وڵاتدا حکومەتێکی مرۆڤدۆست بە مانای ئازادیخوازو بیر ئازادو ڕۆشنگەر جڵەوی کاروبار نەگرێتە دەست، هەموو ئەهلی قەڵەم‌و هەموو دەزگاکانی بڵاوکەرەوەو خزمەتگوزارانی فەرهەنگ‌و وێژە گیرۆدەی ئەو گرفتاری‌و بەدبەختیە دەبنەوەو تا سانسۆر زیاتر سەختگیر بێت قەڵەمەکان زیاتر کزو هەنگاوەکان شل تر دەبن، بە ڕادەیەك کە ترسی ئەوە هەیە بە یەکجاری ئەهلی قەڵەم لەنێو بچن‌و ئەو شیعرە وەڕاست بگەڕێ کە:

(لە دەفتەری زەمانەدا ناوی ڕەش دەبێتەوە
هەر میللەتێك کە خاوەن قەڵەمی نەبوو)
جا خوا ئەو ڕۆژە نەهێنێ!

پ: وەرگێڕان، بە تایبەت ئەمانەت لە وەرگێڕان‌و باوەڕبوون بە ناوەڕۆکەکەی کارێکی ئاسان نییە، بەم ڕوونکردنەوەیە، بۆمان باس بکە کە هەرچەندە زمانی فەرەنسی لە ماڵ‌و قوتابخانە و لە ڕێی کتێبەوە فێربوویت، چۆن دەتوانیت ئەو زمانە لە قاڵبی زمانی خەڵکی خۆماندا دابڕێژیەوە؟

و: هونەری وەرگێڕان دوو پایەی بنەڕەتی هەیە: یەکەمیان تێگەیشتنی ئەو زمانەی کە لێیەوە وەردەگێڕی. دووەمیان هونەری داڕشتنەوەی ئەو تێگەیشتنەی کە وەرتگرتووە لە چوارچێوەی زمانی خۆتدا. لەو ڕوونکردنەوەیەدا ئەو دەرەنجامە ڕازیکەرە وەردەگرین کە وەڵامی بەڕێزت دەداتەوەو ئەویش ئەوەیە کە وەرگێڕ دەبێ ئەو زمانەی کە لێیەوە وەردەگێڕێ تا ئەو ڕادەیە بزانێ کە تێبگا لایەنی بەرامبەر چ دەڵێ بەڵام لە زمانی خۆیدا کە دەیەوێ ئەو ماناو ناوەڕۆک‌و تێگەیشتنەی تێدا دابڕێژێتەوە. دەبێ ئەدیبێکی ڕاستەقینە و تەنانەت دەبێ شاعیر بێت‌و شارەزای هەموو ناسکی‌و وردەکاریەکانی بێت تا بتوانێ ئەو ناوەڕۆک‌و تێگەیشتنە دروست‌و باش‌و وەستایانە دابڕێژێتەوە. هەرگیز لە بیر ناکەم کە بەڕێز (نەجەف دەریابەندەری)ی وەرگێڕی زاناو پایەبەرز لە ڕەخنەیەکی کە بۆ وەرگێڕانی "دوورگەی پەنگوینەکان"ی (ئاناتۆل فرانس)ی منی نووسیبوو لەژێر ناوی "وەرگێڕێک کە ئاناتۆل فرانسی دەرباز کرد" دەربارەی منەوە نووسیبووی "قازی لەنێو دەریای ئەدەبی فارسیدا ژێرئاوێکی لێداوە بێ ئەوەی تیایدا نقوم بێت". بە ڕاستیش دانی پێدا دەنێم کە لە دەریای ئەدەبی فارسیدا ئەو ژێرئاوەم لێداوە کە سەردەمێک نزیکەی سی هەزار بەیتی شیعری شاعیرە جیاجیاکانم لەبەر

بوو. دڵنیام تۆش تێبینیت کردووە کە زمانی شیرینی فارسی ئەوەندەی لە بواری شیعرەوە دەوڵەمەندە هێندە لە بواری پەخشان نووسیندا دەوڵەمەند نییەو لە ڕاستیدا شیعر پایەی بنەڕەتی ئەدەبی فارسی پێکدەهێنێ نەك پەخشان، بەم پێیە کەسێك کە سی هەزار بەیتە شیعری شاعیرانی ناودارو شیرین کامی زمانی فارسی لە سەبکگەلی جیاجیای خوراسانیو عیراقیو هیندیو هیتری لەبەر بێت زمان لە نێودەستیدا وەکو مۆم نەرم دەبێو هەر بابەتێکی کە بیەوێ دایبڕێژێ دارشتنەکەی لە لای ئاسانتر دروست دەبێ لەو کەسەی کە زمان لە لایدا وەك مۆم وا نییە. ئەوەیە کە من پێموایە ئەگەر بە ڕاستی توانایەك لە دارشتنی چەمكو ناوەرۆکە بیانیەکان لە زمانی فارسیدا لە خۆمدا نیشان دەدەم نۆهەد لە سەدی قەرزاری ئەو هەموو شیعرانەم کە لە سەبكو ماناگەلی جیاجیادا لە بەرم بوونو ئەو شیعرانە گەنجینەی واژەو زاراوەو چەمکگەلی ئەدەبیان لە مێشکی مندا دەوڵەمەند کردووە، بە شێوەیەك کە ماناو چەمکەکان بێ خۆماندووکردنێکی زۆری زەهنی بە هۆی بەکارهێنانی بەردەوامی زمان، لەخۆوە جێدەگرنو دادەڕێژرێنو دەکەونە سەر لاپەڕەی کاغەز، بە دڵنیاییەوە ئەگەر ئەو گەنجینە شیعریەی نێو مێشکی خۆم وەك زەخیرەیەك نەبوایە، ئەمڕۆکە ئەو زەوقو مکێزەم لە ڕەواننووسیو جواننووسیی لە وەرگێڕاندا نەدەبوو. هیوادارم کە وەڵامەکەم جێی ڕەزامەندیت بووبێ.

پ: ئێوە کە ئەوەندە بەسەر زمانی فارسیدا زاڵن، چما تا ئێستا کارێکی داهێنەرانەتان ئەنجام نەداوە؟

و: کاکە، تۆ وەرگێڕان ئەویش بە پاراستنی ئەمانەتو وردەکاری دەقە نووسراوەکە، بە کەم مەزانە و ئەوە بزانە کە بە ڕاستی لە نووسینی خودی

ڕووسەرەکە کەمتر نییە بەڵکو زەحمەتترە، چونکە لە وەرگێڕاندا، وەرگێڕ دەستو پێی گیراوەو مافی ئەوەی نییە لەو ناوەڕۆکەی کە دەیخوێنێتەوە بچێتە دەر، لە کاتێکدا نووسەر دەستی کراوەیە و هەرچی حەزی لێ بێو بە هەر ئاوازو زمانێك کە خۆی مەیلی لێ بێ دەتوانێ مەبەستی خۆی بخاتە سەر کاغەز. بەو پێشەکیە، دەمەوێ ئەوە ڕابگەیەنم کە ئەو کارانەی تا ئێستا وەك وەرگێڕان پێشکەشی خوێنەرانی فارسی زمانم کردوون، بە تایبەت وەرگێڕانەکانی وەکو (دۆن کیشۆت) کە سەردەمێك خەڵاتی باشترین وەرگێڕانی وەرگرتووەو "دێ کامیرۆن" و "شازادە چکۆلە" و دواجاریش "زنجیرەی سێیەم" لە ڕاستیدا کاری داهێنەرانەن کە هەمیشە هەر زیندوو دەمێننەوە.

بەڵام من دەزانم مەبەستی تۆ لە کاری داهێنەرانە ئەوەیە کە بۆچی خۆم بەرهەمێکم نەنووسیوە. دەبێ بڵێم کە یەکەم باڵادەستی بەسەر زمانی زگماکی ئەگەر پێویستیش بێت بۆ نووسین مەرجی تەواو نییە و نووسەر دەبێ تایبەتمەندیی دیکەشی هەبێ وەك خوێندنەوەی قووڵ لەسەر کۆمەڵگە و ژیانی شاریو لادێی وڵاتەکەی خۆیو شارەزای مۆراڵو ئەخلاقیاتو بیروباوەڕو تەنانەت زمانە ناوچەییەکانی هاووڵاتیانی وڵاتەکەی بێت تا ئەو بەرهەمەی دەینووسێ ئاوێنەی باڵانمای ئەو کۆمەڵگەیە بێت کە تیایدا دەژیو بۆی دەنووسێ. دووەم من هەر لە سەرەتاکانی کارکردنمدا کە لە ساڵی ١٩٣٩ و ١٩٤٠ بە هۆی دەستکورتیو پێویست بوون بە پارە بۆ کڕینی ئەو پێداویستیانەی کە زانستگەی ئەفسەری داینابوون، دەستم بە کاری وەرگێڕانی (کلودی وێڵگەرد) کردو بەو شەست تومانەی کە لەو کارەدا وەدەستم کەوت هەموو پێویستیەکانی

زانستگەی ئەفسەریم بۆ خۆم کرین حەزێکی زۆرم بۆ نووسین لا دروست بوو و ئەمجارە چیرۆکێکم لەژێر ناوی "زارا یا ئەفینی شوان" بە قەڵەمی خۆم نووسی کە بە داخەوە ئەمڕۆ هەرچەند دەگەڕێم دانەیەکیم دەست ناکەوێ تا بە دەستتێوەردانێك و لادان و زیادکردنێك کە بۆ سەردەمەکە پێویست بێت، دیسان چاپی بکەمەوە. بەڵێ، لەو نووسینەش پەنجا تومانێکم دەستکەوت و پێداویستیەکانمی لە سەردەمی زانستگەی ئەفسەری دابین کردن.

بەڵام بڵاوکەرەوە کە دەزگای چاپەمەنی (ئەفشاری) و لە نێوەڕاستی شەقامی (چراغ بەرق) بوو، زیاتر بۆ وەرگێڕانی کارێکی تر هانی دام نەك بۆ نووسینێکی ترو بە ڕاشکاویە پێی گوتم کە پتر پێشوازی لە کاری وەرگێڕانم کراوە نەك نووسین. ئەوە بوو کە ئەمجارە وەرگێڕانێکم لە سیناریۆی دۆن کیشۆت (نەك سەرجەمی کتێبەکە)دایە دەزگاکە و بەم تەرزە گەیشتمە قۆناغی ئەفسەری و کۆتاییم بە وەرگێڕان بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستیەکانی ڕۆژانەم هێنا. تا ساڵی ١٩٥٠ ئیدی بەلای وەرگێڕاندا نەچووم، هەر بە تەواوی قەڵەمم بەلاوە نابوو تا لەو ساڵەدا بە خولیای ئەو عەشقە دێرینەیەی کە بەرامبەر وەرگێڕان هەمبوو و بۆ قەرەبووکردنەوەی چەند ساڵێك کە بێهوودە لە دەستم دابوو دیسان قەڵەمم گرتەوە دەستم و لەبەرئەوەی هەر لەژێر کاریگەریی قسەکەی (ئەفشاری)دا بووم کە منی لە بواری وەرگێڕان سەرکەوتووانە تر دەبینی، دیسان کەوتمەوە سەر کاری وەرگێڕان تا لە چەند ساڵ پێش ئێستا بڕیارم دا کارێکیش لە نووسینی خۆم پێشکەش بکەم. ئەوە بوو کە دەستم دایە نووسینی "بیرەوەرییەکانی وەرگێڕێك"، ئەگەرچی ئەو کارە هێشتا تەواو

ەبووەو ئومێدیش لەم دەمەدا بۆ چاپکردنی لە گۆڕێ نییە، بەڵام هەر لەو ەوونانەی کە لەو کتێبە لێرەدا هێنامنەوە و لەو بۆچوونانەی کە ووسەران و وەرگێڕانی بەرجەستە دەربارەی ئەو گورتە بەشانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە، دەتوانم ئەوە بڵێم کە بەرهەمێکی سەرکەوتووەو هیوادارم ڕۆژێك دابێ تەواوی بکەم‌و بە چاپی بگەیەنم تا براسیت چەندە پەسند و پێشوازی لێدەکرێ.

لە بیرمە ساڵێك خواڵێخۆشبوو (خوزویە دوکاسترۆ)ی دانەری کتێبی "مرۆڤەکان‌و قرژاڵەکان" وەکو سەرۆکی سمیناری "جیهانی سێیەم لە ساڵی دووهەزار" هاتبووە تاران. چوومە سەردانی‌و نیو سەعاتێك پێکەوە قسەمان کرد. یەکێك لە پرسیارەکانی ئەوە بوو کە ئایا خۆشت کتێب دەنووسیت؟ گوتم نە پرسی بۆچی؟ پێمگوت ئێمە ئەگەر دەرد و ئازارەکانی کۆمەڵگەی خۆمان بخەینە سەر کاغەز بە هۆی ئەو سانسۆرە توندەی کە بەسەر چاپەمەنیەکاندا سەپێنراوە و باڵادەستە بواری چاپ‌و بڵاوکردنەوەمان نابێ، وەلێ کاتێك کتێبی ئێوە کە باس لە دەردو ئازارەکانی کۆمەڵگەی خۆتان دەکات‌و دەتوانم بڵێم ئەو دەردو ئازارانەش هەمان دەردو ئازاری ئێمەن وەردەگێڕینە سەر زمانی فارسی ئەگەر سانسۆریش هاتە نێوەو ڕەخنەی گرت دەڵێین ئەمە زمانی سکاڵاو ناڕەزایەتی گەلێکی دواکەوتووی وەك گەلی بەرازیلە پەیوەندی بە ڕەوشی درەوشاوەی گەل‌و وڵاتی پێشکەوتووی ئێرانەوە نییە. ئاوا بەو فێڵە خۆمان دەرباز دەکەین‌و کتێبەکە چاپ دەکەین. پێکەنی‌و قسەی نەکرد.

بەهەرحاڵ، ساڵحی هێژا، خۆ نابێ هەمووان نووسەر بن، لێبگەڕێ یەك دوانێکیش با وەرگێڕ بن، ئەگەرچی بە داخەوە ئەمڕۆ ژمارەی وەرگێڕەکان

لە نوسەران زیاترەو هەرکەسێك چەند وشەی زمانێکی بیانی فێر دەبێ ڕوودەکاتە وەرگێڕان، بێ ئەوەی زمانی دایکی وەك پێویست بزانێت.

پ: کە کتێبێك وەردەگێڕی چەند جار پاکنووسی دەکەیت؟

و: هەندێ کتێب کە لایەنە ئەدەبیەکەی لەژێر ڕۆشنایی لایەنە چیرۆکیەکەی دایە و خوێنەر زیاتر لە هەوڵی ئەوەدایە کە بزانێ ڕووداوەکە بە کوێ دەگاتو چی بەسەر قارەمانی چیرۆکەکە هاتووە، پاکنووسکردن بە شتێکی زیاد دەزانم، بە تایبەت ئەگەر چاپخانەش پەلەی هەبێ. کتێبی "دایك"ی (ماکسیم گۆرکی) یەکێك لەو کارانەیە و یەکەمین ڕەشنووسەکانی من بێ ئەوەی یەکجاری تریان بخوێنمەوە کە ئایا شتێکم لەبیر نەکردووە یا هەڵەیەکی ڕێنووسیان تیا نییە یەکسەر ڕەوانەی چاپخانە دەکرێن. تەنها لە کاتی هەڵەبڕی دووەمدا کە بە ناچاری جارێکی تر وەرگێڕانە چاپکراوەکە دەخوێنمەوەو ئەگەر چاکسازیێك بە پێویست بزانم لە کاتی هەڵەبڕیدا ئەنجامی دەدەم.

بۆ ئەو کارانەی کە لایەنی ئەدەبیان بەسەر لایەنی چیرۆکیدا زاڵە بێگومان ڕەشنووسی یەکەم بۆ چاپ بەس نابینمو دووبارە پاکنووسی دەکەمەوەو لادانو چاککردنێك یا ڕازاندنەوەیەك کە لە ڕستەسازیدا بە پێویستی بزانم لە پاکنووسکردنەوەدا ئەنجامی دەدەم. "دۆن کیشۆت"، "دەربارەی تێگەیشتنی ئینجیلەکان"، "دێ کامیرۆن"، "کوردو کوردستان"، "قوربانی" و "شازادە چکۆلە" لەو جۆرە کارانەنو تەنانەت دێ کامیرۆن دوای پاکنووسکردنەوەی یەکەم، بۆ جاری دووەمیش پاکنووسکرایەوە. خۆڕا نییە کە دۆن کیشۆتو دێ کامیرۆنو شازادە چکۆلە بە باشترین کارەکانی من لە بواری دارشتنی فارسی دەژمێردرێنو هەمیشە دەمێننەوە. بەمشێوەیە

ەلنیایە کە لە هیچ یەك لە کارەکانمدا کەمتەرخەمی ناکەمو هەمیشە هەوڵم داوەو دەیدەم کە وەرگێڕانێکی ڕەوانو مایەی پەسندی خوێنەران پێشکەش بکەم.

پ: لە سەرەتای کاردا، کێ یا چ کەسانێك هاندەرت بوون؟

و: یەکەمین هاندەرم دەزگای چاپەمەنی (ئەفشاری) بوو کە لە پرسیارەکانی پێشتردا چیرۆکەکەیم گێڕایەوە، دوای ئەوە ئیدی هاندەرێکم نەبووە تا ساڵی ١٩٥٠ کە دووبارە ڕوومکردەوە کاری وەرگێڕانو دوو ساڵ لەوێ بۆ ئەوێ ڕامکردو زەحمەتم کێشا تاکو توانیم بە چاپکردنی کتێبی "دان چەرموو" پەیوەندیی لەگەڵ خوێنەرانی هێژا دروست بکەم. لەو ڕێکەوتە بەدواوە بێگومان خوێنەرانی بەڕێز لە ئاشناو نائاشناوە هەن کە بەردەوام بوونەتە هاندەرمو خوازیاری وەرگێڕانەکانمن. شاد ڕەوان (موجتەبای مینەوی)ی زانای مەزن، جارێك لە گفتوگۆیەکی لەگەڵ کتێبی (مانگی فرانکلین)دا کاتێ سەبارەت بە وەرگێڕەکان پرسیاری لێدەکەن، لە رادەبەدەر لوتف دەفەرموێو دەڵێ من تەنها (محەمەدی قازی)م قبوڵەو باسێك لە ستایشکردنی کارەکانی من دەفەرموێو تەنانەت پێشنیاز دەکات کە هەڤپەیڤینێکیش لەگەڵ مندا بکەن. بۆ دەربڕینی سوپاس لەو هەموو ڕێزو ستایشەی ئەو مرۆڤە مەزنە، ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی کارەکەیم وەرگرتو دوای ئەوەی خۆم پێناساند سوپاسو ڕێزی خۆم لە پای ئەو ستایشو هاندانەی ئەو پیاوە گەورەیە دەربڕی. بەوپەڕی سادەییەوە گوتی پێویست ناکا سوپاسی من بکەیت، سوپاسی خۆت بکە کە کاری باش ئەنجام دەدەیو سوپاسی کاری خۆت بکە کە دروست و مایەی پەسندە، چونکە ئەگەر ئاوا نەبوایە منیش ئەو قسانەم نەدەکردن، وەك چۆن بۆ کەسێکی

ترم نەکردوون. کەوایە هاندەری تۆ، منو کەسانی وەك من نین بەڵکو باشی کارەکانی خۆتە کە دەبێتە هەوێنی ئەو هاندانو سوپاسکردنەت. بەڵێ، بەڕێز ساڵحی هێژا، یەکێ لە باشترین هاندەرەکانی من بە پێی فەرموودەی خوالێخۆشبوو (مینەوی) کارەکانی منەو ئینجا خوێنەرانی خۆشەویستی دەخوێننەوەو پەسندی دەکەنو هانم دەدەن.

پ: کاتێ بۆ دواوە دەگەڕێیتەوە، کارەکانت چۆن دەبینی؟ بۆ نموونە یەکەمین وەرگێڕانت.

و: یەکەمین وەرگێڕانم وەك باسم کرد هەمان کلودی وێڵگەردی ڤیکتۆر هۆگۆیە کە وەختی چاو بە چاپی یەکەمیدا دەگێڕمەوە دەبینم کە هەمان ئەو کارەی یەکەمیشم خراپ نەبووە. لەبەرئەوەی زۆربەی کتێبەکانی من چەندین جار چاپ کراونەتەوە! بۆ نموونە دان چەرموو چاپی نۆیەم، شازادە چکۆلە چاپی دەیەم، دۆن کیشۆت چاپی چوارەم، ئازادی یا مەرگ‌و مەسیحی دیسان لە خاچدراو چاپی شەشەمی هەروەها کتێبەکانی تریشم زۆربەیانم جارێکی تر لەگەڵ دەقە ئەسڵییەکە بەراورد کردوونو هەندێ چاکسازیم تیا کردوون کە پێموایە ڕەوانترو زیاتر لەگەڵ دەقەکەدا وەفادارترم کردوون. هەندێك ئەو چاکسازیانە پەسند دەکەنو لایەنگری لەم کارەم دەکەنو هەندێکیش وەرگێڕانی چاپی یەکەم بە جوانترو باشتر دەزانن. بۆ حاڵەتی دووەم دوو نموونە باس دەکەم: یەکیان بەڕێز (دەریابەندەری) کە پێیوایە وەرگێڕانی دۆن کیشۆت لە چاپی یەکەمیدا باشتر بوو تا لە چاپەکانی دواتردا، ئەوەی تریش (فەرەیدون تەنێکابۆنی)یە کە وەرگێڕانی شازادە چکۆلەی چاپی یەکەمی پێ باشترە لەو چاکسازیو دەستکاریانەی کە لە چاپەکانی دواتریدا تیام کردووە. بەهەرحاڵ من

ئەگەرچی لەو بارەیەوە لەگەڵ بۆچوونی هەردوو بەڕێزدا ناکۆکم ڕێز لە بۆچوونەکەیان دەگرمو کارەکانی خۆم بەو دەستکاریو چاکسازیانەی کە تیایاندا ئەنجام دەدەم خراپ ناکەم بەڵکو باشتریان دەکەم.

جا نازانم پەسند دەکرێن یان نا.

پ: لە هەموو وەرگێڕانەکانت کە تا ئێستا ئەنجامت داون، کامیانت لە هەمووان زیاتر بە دڵە؟

و: لە ڕووی خۆشحاڵبوون لە کاری وەرگێڕاندا بە مانای ئەدەبیی وشەوەو لە ڕووی داڕشتنی ڕەوانکارانەی فارسی (دەری)، دۆن کیشۆت، دێ کامیرۆن، شازادە چکۆلەو دوورگەی پەنگوینەکان. لە ڕووی سیاسیو کۆمەڵایەتی، نانو شەراب، بەسەرهاتی پێشەوایەکی شەهید، قوربانی، دەربارەی تێگەیشتنی ئینجیلەکانو قەڵای مالویل. لە ڕووی مێژوویی، ناپلیۆنو کوردو کوردستان کە لە ژێر چاپدایەو هێشتا بڵاونەبۆتەوە (دواتر بڵاوبووەوە- و. ك).

لە ڕوانگەی زانستی، تێڕوانینێك بۆ سروشتو نهێنیەکانیو زەویو کات. بەڵام هەروەك چۆن جارێکی تریش باسم کردووە هەریەك لە کارەکانی خۆم وەرگێڕانو ئەوانی تر بە جگەرگۆشەکانی خۆم دەزانمو لە دڵەوە هەموویانم خۆش دەوێنو لە ڕووی سۆزو خۆشەویستیەوە جیاوازیان پێناکەم.

پ: بەرلەوەی دەست بە کاری وەرگێڕان بکەیت، پێتخۆش بوو ببیت بە چی، و لەوی دەمیدا تا چ ڕادەیەك لەگەڵ کلتورو هونەری ڕۆژئاوادا ئاشنا بوویت؟

و: پێموایە وەڵامی ئەم پرسیارەم لە وەڵامەکانی پێشتری پرسیارەکانتدا دابێتەوە، بەڵام لە ڕێڕەوی ژیانمدا بە پێشینەیەك کە وەك فێربوونی زمانی فەرەنسی هەمبوو، هەمیشە حەزم لێبوو و حەزم لێیە کە هەر خەریکی ئەم کارەی وەرگێڕان بم. هەڵبەتە وەرگێڕان کارێکی هەمیشەیی‌و نزیکی من بووەو خۆم سی‌و چەند ساڵ کارمەندی فەرمانگە بووم کە هەرگیز بەهایەکم بۆ دانانەوەو بایەخێکم پێنەداوە، وەك چۆن هەندێ لە هاوڕێکانی من بە خوێندواری‌و توانای کەمتریش لە من گەیشتوونەتە پلەوپایەی بەڕێوەبەری گشتی‌و بریکاری وەزارەت‌و تەنانەت پۆستی وەزارەتیشەوە، وەلێ من لە پۆستی بریکاری دادگاو دادوەری ئەو دادگایە زیاتر نەڕۆیشتووم‌و خوازیاریشی نەبووم، چونکە بە ڕاستی تەنها ئارەزووم لە کاری وەرگێڕان هەمبووە. لە دائیرەشدا زۆربەی ئەو کاتانەی کە کارێکمان نەبوایە بیکەین، من لە جیاتی ئەوەی وەکو ئەوانی تر خەریکی چای خواردنەوەو قسەکردن‌و چوونە ژووری ئەم‌و ئەو بم، قەڵەم‌و کاغەزو کەلوپەلی وەرگێڕانم دەهێناو خەریکی کاری خۆم دەبووم. ئاشنابوونیشم بە کلتوورو ئەدەب‌و هونەری ڕۆژئاوا هەر لە هەمان سەردەمی ئاشنابوونم بە زمانی فەرەنسی‌و لەگەڵ وەرگێڕانەکانمدا دەستی پێکردو ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بوو.

پ: ڕاسپاردەو ڕێنوێنیی بەڕێزت بۆ وەرگێڕ و نووسەرانی لاو چییە؟

و: ڕاسپاردەو ڕێنوێنی من بۆ نووسەران‌و وەرگێڕە لاوەکان هەر دەبێ لە بواری کارەکەیانەوە بێ‌و بۆیە یەکەم داوا لە نووسەرانی لاو دەکەم کە تا دەتوانن‌و هەلومەرج ڕێگەدەدا، ئامانجیان لە کاری نووسین بریتی بێ لە ڕۆشنبیرکردنی نەوەی نوێ‌و کۆمەڵانی خوێندەوارو دەردو ئازارەکانی

کۆمەڵ باس بکەنو ڕێچارەیان بۆ دیاری بکەنو بە کورتی تۆزقاڵێک لە والعیبیو والنەیکەرایی دوورنەکەونەوە. هەمیشە هەوڵ بدەن کە نووسینەکانیان بە ڕێرەوی خەبات دژی خورافیاتو دەمارگیریی کوێرانەو لە ڕێی هەوڵدان بۆ چاککردنی ژیانی ماددیو مەعنەوی خەڵکدا بێت، و بە تەواوی بە دڵەو هەنگاو و بیرو هێزی خۆیان لە خزمەتی کۆمەڵانی خەڵکدا بن لە پێناو باشترو خۆشترکردنی ژیانو گوزەرانیانەوە.

ڕاسپاردەو ڕێنوێنیشم بۆ وەرگێڕەکان ئەوەیە کە هەر لەبەرئەوەی هەندەستو پارەیەک لە بری زەحمەتیەکانیان وەردەگرن تەنها بۆ ئەوە کارنەکەن، بەڵکو تەنها ئەو بەرهەمانە وەربگێڕن کە لە هەمان ئەو هێڵەدا بن کە بۆ نووسەران خستمە ڕوو. دەردو گرفتاریو بەدبەختیەکانی هەموو ئادەمیزادێک لەسەر گۆی زەوی هی هەمووانە، وەک شاعیری گەورە "سەعدی" دەڵێ:

(بەنی ئادەم ئەندامانی یەکترن

کە لە دروستبووندا لە یەک گەوهەرن

کە ڕۆژگار ئەندامێك دەخاتە ئازار

ئەندامەکانی تر نایانبێ قەرار

تۆ کە لە ئازاری ئەوانی تر بێ غەمی

ناشێ کە ناوت بنێن ئادەمی)

بەم پێیە ئەگەر کتێبێکیان خرابە بەردەست کە تەنها لایەنی سەرگەرمکردنو چیرۆکی هەبوو و هیچ باسی لە دەردو ئازاری کۆمەڵانو گرفتاریەکانیان لەژێر چەنگی داگیرکەرانو چەوسێنەران تیا نەبوو کاتی ژیانی خۆیان با بە وەرگێڕانی ئەو جۆرە کتێبە بە فیڕۆ نەدەن.

تا ئێرە ڕاسپاردەو ڕێنوێنییەکانم بۆ نووسەران و وەرگێڕەکان و ڕێڕەوو ناوەڕۆکی نووسین و وەرگێڕانەکانیان بوو، بەڵام بە پێویستی دەزانم هەندێ ڕێنوێنی و ڕاسپاردەش پەیوەست بە هەمان کاری وەرگێڕان بۆ وەرگێڕە لاوەکان بکەم تا ئەگەر پەیڕەویان لەو ڕێنوێنیانە کرد کە بەرهەمی ئەزموونی منن، کارەکەیان زیاتر سەرکەوتووانە بێت. بۆئەوەی کە وەرگێڕانێك سەرکەوتوانە ئەنجام درابێت پێویستە وەرگێڕەکەی وەڵامی پۆزەتیڤی هەفت پرسیاری خوارەوەی دابێتەوە. ئەگەر وەڵامەکانی بۆ ئەو هەفت پرسیارە بە ڕاستی پۆزەتیڤ بوون یا بە دڵنیایەوە بزانێ کە کارەکەی سەرکەوتووە، ئەگەرنا دەبێ بۆ وەڵامدانەوەی پۆزەتیڤی پرسیارەکان کۆشش و وردەکارییێکی زیاتر بکات. ئەمەی خوارەوە هەفت پرسیارەکانن:

١-ئایا وەرگێڕانەکە مانای دەقە ئاسڵیەکەی گەیاندووە؟

ئەمەیان بەندە بە زانینی زمانەوە، واتە وەرگێڕ ئەو دەقەی کە دەیەوێ بیکات بە فارسی باش تێگەیشتبێ و نەچێ مانایەکی جیاواز لە هی دەقەکە بێنێتەوە. ئەگەر لە دەقەکەدا گوترابێ بۆ نموونە "حالّی من باش نییە"، و وەرگێڕی بەڕێز ئەو ڕستەیەی گۆڕیبێ بۆ "پێم باش نییە بڕۆم" وەرگێڕانەکە مانای دەقەکەی نەگەیاندووە. لە بیرمە جارێك کتێبێکم لە بارەی جەنگی دووەمی جیهانی دەخوێندەوەو ڕووبەڕووی ڕستەیەك بوومەوە تیایدا، کە زۆر ناکۆك و ناپەیوەست بوو لەگەڵ ڕستەکانی تری. ڕستەکە ئاوابوو: "سێ درەختی هەنار لە ڕێی فەرەنسا وشك دەبوون!" هەرچی هێنام و بردم کە ئەو ڕستەیە لێرە چ مانایەکی هەیە و بە ڕاستی درەختی هەنار لە ڕێی فەرەنسا لە کوێ پەیدا دەبێ تا وشك بێ یا نەبێ،

عەقڵم بە جێیەك نەگەیشت و تێینەگەیشتم. بە ڕێکەوت دەقە فەرەنسیەکەم دەسکەوت و بینیم کە ڕستەکە بەم شێوەی خوارەوەیە:
(Trois grenadiere s'en retournaient en France).
هەڵەی وەرگێڕی خۆشەویستی ئێمە کە ناوەکەیم لە بیرچۆتەوە، لە لێکدانەوەی وشەی (گرێنادیە)دا بوو کە لە زمانی فەرەنسیدا هەم بە واتای درەختی هەنار دێت و هەم بە واتای نارنجۆك هاوێژ یا سەربازی هەڵبژاردە. کە لە ڕاستیدا ڕستەکە دەبوا ئاوا وەرگێڕدرابوایە: "سێ نارنجۆك هاوێژ دەگەڕانەوە بۆ فەرانسە". جا ئێستا چۆن کرداری "دەگەڕانەوە" بە "وشك دەبوون" ماناکراوەتەوە، وا دیارە وەرگێڕ بیری کردۆتەوە درەخت کە ناتوانێ بگەڕێتەوە کەوایە مۆسکەر گەڕانەوەی ئەو بە مانای هەمان وشك بوونەوەیە. بەڵێ، مەرجی یەکەم ئەوەیە کە ماناکە بە دروستی وەرگێڕدرابێت.

٢-ئایا شێوازی دەربڕینی نووسەر پارێزراوە؟

هەڵبەتە هەر نووسەرێك خەسڵەت و خولق و خوویێکی تایبەت بە خۆی هەیە، هەندێکیان هەر بۆ خۆیان چالاك و شادو دەم بە پێکەنین و گاڵتەچی و نوکتەباز و خۆشن، هەندێکی تر سەنگین و بەشکۆن بەڵام وریاو شەیتانن و قسەکانیان زیاتر بە پێچ و پەناو هێما دەردەبڕن، هەندێکیش وشك و ڕەقەکارن و هیچ ناسکی و گاڵتەو گەپێك لە نووسینەکانیان بەدی ناکرێ. لە نموونەی گروپی یەکەم نیکۆس کازانتساکیس، لە نموونەی گروپی دووەم ئاناتۆل فرانس و لە نموونەی گروپی سێیەمیش دەتوانم ناوی ڕۆمەن ڕۆڵان بێنم، کە لە هەرسێکیانەوە کتێبم وەرگێڕاوەو شارەزای خوو و خلەو ئەخلاقیان بووم. من کە نمونە بە کارەکانی خۆم دێنمەوە بۆ خۆهەڵکێشانم نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە زیاتر شارەزای کارەکانی خۆمم و باشتر

دەتوانم نموونەیان لەسەر بێنمەوە. لە نووسەری یەکەم سێ کتێب واتە (ئازادی یا مەرگ)، (مەسیحی دیسان لە خاچدراو) و (زوربای یۆنانی)م وەرگێڕاون. لە نووسەری دووەم (دوورگەی پەنگوێنەکان) و لە نووسەری سێیەمیش (مهاتماگاندی)م وەرگێڕاون. تۆ کە ئەو کتێبانە دەخوێنیەوە دەبینی کە هەمان خوو و خەسڵەتی گاڵتەبازیو نەستەقکاری یا زیپکو وریاییو گۆشەگیری یا وشکو برینگیو ڕەقەکاری لە نووسینەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوەو وەرگێڕی سەرکەوتوو بێگومان ئەو کەسەیە کە بتوانێ هەمان حاڵەتەکان لە وەرگێڕانیشدا ڕەنگ پێبداتەوە، بە چەشنێک کە خوێنەر لە ڕووی وەرگێڕانەوە پەی بە ماهیەتی خودیو ئەخلاقیی نووسەرەکە ببات. نموونەیەکی دیکە (شازادە چکۆلە)یە کە نیشان دەدا نووسەر مرۆڤێکە ناسکبینو قسەخۆشو شاعیرپیشە. بە کورتی هەموو تایبەتمەندیەکانی نووسەر لە شێوازو ئاوازی گوتنو دەربڕینیدا ڕەنگ دەداتەوەو وەرگێڕی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە ئەو شێوازو ئاوازە لە دەقە وەرگێڕدراوەکەشیدا ڕەنگ پێبداتەوە، هەرچەند "بفەرموو" و "دانیشە" و "ڕوونی" هەرسێکیان بە یەك مانان، بەڵام وەرگێڕ دەبێ ئاگای لەوە بێ کە نووسەر بە چ ئاوازێك فەرمانی دانیشتنی داوە ئەویش بە هەمان ئاواز وەری بگێڕێ.

٣-ئایا وەرگێڕ زمانی گونجاو لەگەڵ دەقەکەی دۆزیوەتەوە؟

بە هەڵە نەچین کە زمانی تایبەتو گونجاو لەگەڵ دەق جیاوازە لە ئاوازی نووسەر. نووسەرێك بە زمانی (عامیانە) یانی زمانی (ئارگۆ) شت دەنووسێو نووسەرێکی تر بە زمانی ئەدەبیی باو لە نووسیندا. بێگومان وەرگێڕ دەبێ کتێبی یەکەم بە زمانی عامیانە یا ئارگۆیی وڵاتەکەی خۆی

وەربگێڕێ، وەك چۆن زۆربەی نووسەرانی ئەمریکایی لە نێویاندا (ئەرنێست هەمینگوای) و (جان شتاین بەك) و هیترو هەروەها نووسەرە تازەکانی فەرەنسیو ئینگلیزیو هیتریش ئاوا دەکەن، وە کتێبی جۆری دووەمیش بە زمانی ئەدەبیی خۆیەوە. هەندێ لە نووسەرانیش هەن کە سەر بە سەردەمانێکی کۆنترن، بۆ نموونە دیسان نموونە بە نووسەرانی جێی سەرنجی خۆم دێنمەوە، (سێرفانتس) نووسەری (دۆن کیشۆت) سەر بە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەی زایینی واتە سەرەتاکانی قۆناغی (سەفەویە)وەیەو (بوکاچیۆ)ی نووسەری (دێ کامیرۆن) سەر بە نێوەڕاستەکانی سەدەی چواردەی زایینی واتە هاوسەردەمی (حافز)ە، و گومانی تیا نییە کە پەخشانی دەقی کتێبەکانی ئەوان لەگەڵ پەخشانی دەقی سەردەمی خۆیان جیاوازی هەیە. وەرگێڕی بەرهەمەکانی ئەو نووسەرانە بۆ زمانی فارسی دەبێ بتوانێ زمانی فارسییێکی هاودەم لەگەڵ سەردەمی ئەواندا بدۆزێتەوەو لە وەرگێڕاندا کاری پێبکا، یەکێك لە شانازیەکانی من ئەوەیە کە هەمووان دەڵێن من لە وەرگێڕانی دۆن کیشۆتدا زمانی گونجاو لەگەڵ دەقەکەم دۆزیوەتەوە، لە وەرگێڕانی دێ کامیرۆنیشدا هەر ئاوامو کاتێ کتێبەکە بڵاوکرایەوە ڕاستی قسەکەم دەردەکەوێ.

ء ئایا وەرگێڕ دەستەواژەی دروستو وردو خۆش ئاوازی هەڵبژاردوون؟

هەمووماں دەزانین کە وشەیەك بۆی هەیە چەندین مانای جیاجیای هەبێ. (مەولانا) واتەنی لە (مەسنەویەکەیدا:

(ئەمەیان شیرە لە نێو (بادیە)دا
ئەوەی تر شێرە لەنێو (بادیە)دا
ئەمەیان شیرە کە مرۆڤ دەیخوا

ئەوەی تر شێرە کە مرۆڤ دەخوا)

جگە لەوە هەر وشەیەك بەهەر مانایەکەوە بێت ڕەنگە ماناگەلێکی تریشی هەبێ، بۆ نموونە غەمگین، دڵبەغەم، غەمناك، غەمبار، غەمزەدەو غەمین هەموویان یەكُ مانایان هەیە، بەمپێیە وەرگێڕ دەبێ وشەی دروستو لە جێی خۆی لە ڕووی ماناو خۆش ئاوازیو لە ڕووی جوانیو هاوسەنگبوونی وشەکانەوە بۆ وشە بیانیەکە هەڵبژێری. لەو بارەیەوە دیسان نموونەیەکی بچوك لە کارەکانی خۆمەوە دێنمەوە، لەبەرئەوەی زۆر شارەزای کاری ئەوانی تر نیم، سێرڤانتسو وەرگێڕە فەرەنسیەکەی نازناوی (Chevalier de la Triste figure)یان داوەتە (دۆن کیشۆت کە "شێڤالیە" واتە "پاڵەوان"، "تریست" واتە "غەمناك" و "غەمگین" و "فیگور"یش واتە "سیماو ڕوخسار"،جا من بۆ پاراستنی خۆش ئاوازی وشەکانو گونجاو بوونیان لەگەڵ دەقەکە، هاتووم بە (پاڵەوانی سیماغەمگین) وەرمگێڕاوە.

٥-ئایا لە نوسینەکانیدا بنەماو ڕێزمانی زمانەکەی لەبەرچاو گرتووە؟

ئەم بەشە پێویستی بە زۆر ڕوونکردنەوە نییەو گومانی ناوێ کە دروستیو ڕاستبوونی ڕستەکان پەیوەندی بەوەوە هەیە کە بنەمای ڕێزمانی زمانیان تیادا لەبەرچاو بگیرێ، بۆ نموونە کاتێ کە قسە لەسەر مرۆڤەکانە دەبێ بە پێی کرداری (کۆ) بۆ گیانداران ڕستەکە دابڕێژێو بە پێچەوانەشەوە بۆ شتە بێگیانەکان دەبێ بە هەمان شێوە بە پێی کرداری (کۆ) بۆ بێگیانەکان ڕستەکە ڕێك بخرێت. (لە ڕێزمانی فارسیدا دوو جۆر (کۆ) هەن، بۆ شتە گیاندارەکان (ان) و بۆ شتە بێگیانەکانیش (ها) ئەگەرچی هەموو کات ئەو بنەمایە لەبەرچاو ناگیرێ- وەرگێڕی کوردی-). لە

هاوجووتکردنی (کردار) و (بکەر) و (کۆ) و (تاك) و بە کورتی دەبێ هەموو وردەکاریە رێزمانیەکان رەچاوبکرێن‌و وردبینییان تیابکرێ‌و بە شێوەیەك بنووسرێ کە رەخنەیەکیان لە رووی رێزمانیەوە نەهێتە سەر.

٦ ئایا درێژیی باس یا بە پێچەوانە، کورتکردنەوەی نووسەرەکە لەبەرچاو گیراوە؟

ئەم بەشەش پێویستی بە روونکردنەوەیەکی زۆر نییە. نووسەرێك هەیە کە کورت دەنووسێ وەکو شاعیرانی خۆمان کە هەندێ جار ناوەرۆکی کلتێك لەنێو بەیتە شیعرێکدا جێدەکەنەوە، هەروەها نووسەرێکیش هەیە کە درێژدادڕەو بابەتەکەی زۆر شیدەکاتەوەو بەدوایدا دەڕوا. وەرگێڕ لە سەریەتی ئەو تایبەتمەندیە لە وەرگێڕانەکەی خۆیدا بپارێزێ‌و وەکو خودی نووسەرەکە ئەگەر بە کورتی بڕیبێتیەوە ڕستەکەی ئەو روون‌و شی بکاتەوە، ئەگەر بە پێچەوانە نووسەرەکە بە درێژی نووسیویە ئەویش بە هەمان شێوەی وەربگێڕێ.

٧ ئایا بایەخی پێویست بە خالگوزاری دراوە؟

ئەم خاڵە هەرچەندە لە ئەدەبیاتی کلاسیکی ئێمەدا باو نەبووەو رەچاو نەکراوە، بەڵام ئەمڕۆکە بە لاساییکردنەوە لە شێوازی داڕشتنی ئەوروپاییەکان زۆر باوی پەیدا کردووەو زۆریش یارمەتی تێگەیشتنی باسەکە دەدات. بۆیە وەرگێڕ دەبێ وەکو خودی نووسەر مەسەلەی خالگوزاری لەبەرچاو بگرێ‌و بیپارێزێ، ئەگەر ڕستەکە لە سەری دێڕدایە لە سەر دێڕەوە دابنرێت‌و ئەگەر کۆتایی هاتووە خاڵ دابنێت.

نیشانەکانی تری وەکو نیشانەی پرسیارو سەرسوڕمان‌و دووخاڵ‌و وێرگول‌و پارانتێزو گیومەو هیتر لەهەر کوێیەك پێویست بێ فەرامۆشی نەکات‌و دایانبنێت.

لە سەرجەم ئەو بنەماو ڕێوشوێنانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن بە کورتی ئەو ئەنجامە وەردەگرین کە وەرگێڕان لە خۆگری دوو بەشی گشتیە: یەکەمیان دۆزینەوەی ماناو پەیامی ئەو دەقەی کە وەردەگێڕدرێ. دووەمیان دۆزینەوەی سەبکی نووسەر لەو دەقەدا. کەوایە هاوکێشی یەکەم هاوکێشی ماناو هاوکێشی دووەمیش هاوکێشی سەبك‌و هەمووشیان هاوکێشی گشتن. هاوکێشی یەکەم کە هاوکێشی مانایە بابەتی پرسیاری یەکەمە لە هەفت پرسیارەکان‌و هاوکێشی دووەم واتە هاوکێشی سەبك بابەتی شەش پرسیارەکەی ترە کە تایبەتمەندیەکانی وەك ئاوازی گوتن‌و دەربڕین، تەنز، نوکتە، زمان (عامیانەو ئەدەبی)، هەڵبژاردنی دەستەواژەکان، یاریکردن بە وشەکان، چڕ یا سادەو ساکار بوون، کورت یا درێژبوونی ڕستەکان‌و خاڵگوزاری لەخۆ دەگرێ. هیوادارم کە ئەم ڕوونکردنەوانە بۆ وەرگێڕە لاوەکان سوودیان هەبووبێ.

پ: سوپاس، چەند دوای کارێکی وەرگێڕان، دەست بە کارێکی تر دەکەیت؟ و ئایا ڕێککەوتووە کە دوو یا چەند کتێبێك هاوکات لەگەڵ یەکدا وەربگێڕی؟

و: ئەمە پەیوەستە بەو گفت‌و وادانەی کە داومن. بە گشتی کەمتر ڕێککەوتووە کە دوو کتێب لە یەك کاتدا وەربگێڕم. ئێستاش کە ڕۆژانی پیری تەی دەکەم کەمتر ئەو کارە دەکەم‌و وەکو چرایەکم لێهاتووە کە نەوتەکەی لە تەواوبووندا بێت‌و هەرکە بیستت کوژایەوە.

پ: وەك مرۆڤێکی پێشڕەوو پێشەنگ، لەو ڕووە کە دەریچەیەکت لە کلتورو هونەری گەلانی تر بۆ خوێنەرانی فارسی زمان کردۆتەوە، چ هەستێکت هەیە؟

و: من خۆم بە کەسێکی خاوەن ئەرك‌و مولتەزیم بە خزمەتکردنی وڵاتەکەم دەزانم‌و بێگومان ئەمە دەبێ هەستی هەر هاوڵاتیەکی نیشتمانی خۆشەویستمان ئێران بێت بەڵام تواناو ئامادەیی‌و ڕادەی هۆشیاریەکان لە یەکتر جیاوازن‌و دواجار جۆری خزمەتکردنەکان جیاوازیان دەبێ. خزمەتکردنی من‌و نەبەردی من لە ڕێی قەڵەمەوەیەو قەڵەم چەکی منە. لەو بارەیەوە نوکتەیەکی خۆشم بەبیرهاتەوە کە گێڕانەوەی تام‌و چێژێکی دەبێ. هاوینی ساڵی ١٩٧٩ کە سەرەتاکانی شۆڕشی ئێران بوو بۆ سەردانی خزمان سەرێکمان لە سەقزو مهاباد دا. لە ساری قامیش کە گوندێکە لەسەر ڕێگای نێوان بۆکان‌و میاندواو میوانی ئامۆزایەکمان بووین. کوڕەکەی کە لاوێکی شۆخ‌و هەڵکەوتوو بوو تازە تفەنگێکی (ژ. سێ)ی کڕیبوو. کەوتە پێداهەڵدانی تفەنگەکەی‌و هەروەها چوو تفەنگەکەشی هێنا کە نیشانی ئێمەی بدات. من کە هیچم لە تفەنگ‌و تایبەتمەندیەکانی نەدەزانی بۆ هاندانی ئەو دەستمکرد بە پێهەڵگوتنی تفەنگ‌و گوتم بە ڕاستی تفەنگێکی چاك‌و جوانە، بێ ئاگا لەوەی کە لەنێو کوردا وا باوە ئەگەر پەسنی شتێکیان بکەیت‌و پێی هەڵبڵێی، یەکسەر دەڵێن پێشکەشە! و پێشدادەگرن کە لایەنی بەرامبەر دیاریەکەیان قبوڵ بکات. ئەو دەردەسەریەش بەسەر مندا هات‌و کوڕی ئامۆزاکەم یەکسەر گوتی پێشکەشە! سوپاسم کردو پێمگوت من هیچ پێویستیم بە بەکارهێنانی تفەنگ نییە، بۆ خۆتان پێویسترو شایستەترە. پێداگرت کە نە، مادام پێتان جوانەو پەسندی دەکەن، منیش پێشکەشتانی

دەکەم، گەڕانەوەشی نییە و دەبێ قبوڵی بکەیت. هەرچەندی گوتم کوڕە لاوی هێژا، من چ کارم بە چەك هەیە و پێویستم پێی نییە، سوودی نەبوو. باوکی‌و میوانەکانی تریش پێیانگوت کە قازی دیاریەکەت قبوڵ ناکات‌و پێویستی پێ نییە، تۆش ئیدی ئینکێری مەکە، بەڵام ئەو بە گوێی دانەچوو و زیاتر پێداگری کرد کە دەبێ تفەنگەکە هەڵبگرم. کاتێ بینیم ناچێتە ژێر بار، گوتم گیانی دڵم، من چەکەکەی تۆم ناوێ، چونکە خۆم چەکم هەیە، بە سەرسوڕمانەوە پرسی بەڕێزتان چەکتان هەیە؟ گوتم بەڵێ. نەك تەنها ئەو، ئامادەبووانی تریش پێیان سەیر بوو بە سەرسوڕمانەوە سەیریان کردم. لاوەکە گوتی: ئەدی چەکەکەت کوا؟ دەستم بردە گیرفانم‌و قەڵەمەکەمم دەرهێناو نیشانیم داو گوتم: فەرموو، ئەمە چەکی منە! بووە پێکەنین‌و هەموویان ئافەرینی ئەو وەڵامە خێرایەی منیان کردو کاریگەریی ئەو قسەیە لەسەر لاوەکە بە رادەیەك بوو کە ئیدی وازی لە پێداگرتنی خۆی هێناو وازی لێهێنام. بەڵێ، ساڵحی هێژا، هەستێکی خۆشم لەو خەبات‌و خزمەتکردنەی خۆم بۆ کردنەوەی دەریچەیەك بە ڕووی کلتورو هونەری ڕۆژئاوا هەیە، بە تایبەت ئەو هەستە کاتێك لە ترۆپك دایە کە پیرو لاوانی خوێنەری کتێبەکانم لە ژن‌و پیاوەوە دەبینم بە چ سەفاو دڵسۆزیەکەوە باس لە کارەکانم دەکەن‌و ستایشی زەحمەتی‌و ماندووبوونەکانم دەکەن. لەو بوارەوە زۆرم چیرۆکی خۆش لە ڕووبەڕووبوونە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ خوێنەرانی وەرگێڕانەکانم هەن کە بە ڕاستی ئەگەر بمەوێ هەموویان بگێڕمەوەو باسیان بکەم، لە دووتوێی چەندین کتێبدا جێیان نابێتەوە، لەوەش دەترسم کە بە خۆپەسنی‌و خۆهەڵکێشانیش لێکبدرێتەوە..

پ: بڵاوکەرەوەکان لە خوێنەران زیاتر لە تۆ ڕازین، تۆ چۆن؟ ئایا هیچ کێشەو ئاستەنگت لە بواری چاپکردنی بەرهەمەکانەوە لەگەڵ بڵاوکەرەوەکان نەهاتۆتە ڕێ؟

و: لەوەیدا کە دەفەرموێ بڵاوکەرەوەکان زیاتر لە خوێنەران لە من ڕازین پێم وایە غەدرم لێدەکەی. بڵاوکەرەوەکان زۆربەیان نە کتێبخوێنن‌و نە باشی‌و خراپی کاری کەسێك وەك پێویست دەرك دەکەن. ئەوان چاوو گوێیان بڕیوەتە دەمی خوێنەران تا ببینن‌و ببیسن کە داخۆ ئەوان تاریف لە کارەکانی کێ دەکەن. لە دەستپێکی ئەم هەڤپەیڤینەدا بۆم گێڕایەوە کە دوو ساڵ ڕامدەگرتو کتێبەکەیان بۆ چاپ نەدەکردم، بەو پاساوەی کە خوێنەران تۆ ناناسن. بەڵام هەرکە یەکەمین کتێبمیان (دان چەرمووی جەك لەندەن) چاپ کردو خوێنەران بە دانپێنانی خودی بڵاوکەرەوە لێك لێکە دەهاتن‌و دەیانپرسی: "ئەم وەرگێڕە کێیە کە تا ئێستا کارەکانی چاپ نەکراون، پێی بڵێن با دیسان وەربگێڕێ!" ئەوکات بوو کە ئەمجارە بڵاوکەرەوەی بەڕێز کەوتە تکاو پاڕانەوەو داوای کارو بەرهەمی لێکردم. کەوایە بزانە بڵاوکەرەوەکان تەماشای دەمی خوێنەران دەکەن‌و ڕەنگدانەوەی قسەی ئەوانن‌و تا ژمارەیەکی زۆر لە خوێنەران نووسەرێك یا وەرگێڕێك پەسەندو پشتڕاست نەکەنەوە، بڵاوکەرەوەکان تێڕوانینێکی پۆزەتیڤ سەبارەت بەو نووسەرە یا ئەو وەرگێڕەیان لا دروست نابێ. بەهەرحاڵ من ئەو خۆشبەختیە بۆ خۆم هەست پێدەکەم کە بڵاوکەرەوەکان‌و خوێنەران هەردووکیان لە کارەکانم ڕازین‌و هیچ ئاستەنگ‌و گیروگرفتێکیشم لە کاری چاپکرندا لەگەڵ بڵاوکەرەوەکان بۆ نەهاتۆتە پێش، جگە لە سەرەتاکانی کارم نەبێ کە هەندێکیان کە بانگەشەی

دۆستایەتیشیان دەکردو چووبوونە (مەککە) و ببوونە حاجیش کڵاویان لەسەر دەنام‌و چەندین جار کتێبەکانمیان چاپ دەکردەوەو وەکو چاپی یەکەم دەیانخستنە ڕوو بۆ ئەوەی ئیدی هیچ پارەیەك نەدەنە من. خوا لێیان ڕازی نەبێ!

پ: بە ڕاست، بۆچی بەشی یاسات هەڵبژارد؟

و: پێشتر باسمکرد کە لە تاران لە ژێر ئەرك‌و چاودێری مامم دکتۆر (جەوادی قازی) دەرسم دەخوێند. لەو سەردەمیدا قۆناغی ئامادەیی شەش ساڵ بوو. سێ ساڵی یەکەم وەك قۆناغی ڕێنمایی تەواو هاوبەش بوو و هەمووان پێکەوە دەرسیان دەخوێندو بەو سێ ساڵەیان دەگوت (سیکل)ی یەکەم. بە سیکلی دووەم واتە لە کلاسی دەهەم بەدواوە کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێ قۆناغی تیۆری. خوێندن بە دوو بەشی زانستی‌و ئەدەبی دابەش دەبوو. دیپلۆمی ڕشتەی زانستی بۆ ئەو کەسانە باش بوو کە دەیانویست ببنە پزیشك یا ئەندازیار یا لانی کەم مامۆستای بیرکاری‌و فیزیاو کیمیاو سروشتی، و دیپلۆمی ئەدەبی بۆ خوێندنی زمان‌و ئەدەبیات‌و یاسا کەڵکی لێوەردەگیرا. مامم پێیدادەگرت کە من بچمە ڕشتەی زانستی‌و ببمە پزیشك یا ئەندازیار، بەڵام من لەبەرئەوەی بیرکاریم باش نەبوو، نەمدەویست ڕشتەی زانست هەڵبژێرم. ناچاری کردم‌و بێ دەستی خۆم چوومە ڕشتەی زانستی. لە تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ لە بیرکاری کەوتم‌و دواتریش نەمتوانی نمرەی پێویست بێنم، بە ناچاری ڕازیم کرد کە بۆ ڕشتەی ئەدەبی بگەڕێمەوە. قبوڵی کرد بەو مەرجەی کە یاسا بخوێنم‌و ئەو لە ڕاستیدا پێیوابوو کە ئەدەبیات نانی لێ پەیدا نابێ‌و مرۆڤ یا دەبێ ببێتە دکتۆر یا ئەندازیار تا ژیان‌و گوزەرانێکی باش‌و خۆشی هەبێ‌و ئەگەر

نەبووە هیچ کام لەو دوانە لانی کەم ببێتە پارێزەر. بەم تەرزە ساڵێکی تەمەنم لە ڕشتەی زانستی بەخەسار چوو و خۆشبەختانە توانیم بگەڕێمە ڕشتەی ئەدەبی. کاتێکیش کە دیپلۆمی ئەدەبیم وەرگرت بە پێی ئەو گفتەی کە بە مامم دابوو چوومە کۆلیژی یاسا، بەڵام چاوم هەمیشە هەر لە دوای ئەدەبیات‌و زمان بوو و هێشتا هەر وام.

پ: ببوورە مامۆستا. دوای چەندین ساڵ ئاشنایەتیم لەگەڵ بەڕێزت، دەزانم کە عاشقی غەزەلەکانی (حافزی شیرازی) بیت، لە بارەی حافزو غەزەلەوە قسەمان بۆ بکە..

و: لە بیرمە ئەو کاتەی کە لە ڕشتەی ئەدەبی ئامادەیی خانەی هونەر دەمانخوێند، پێیاندەگوتین جیاوازی هەیە لە نێوان شیعرو هەڵبەست (شعرو نظم) و لە پێناسەکردنی ئەو دووانەدا دەیانگوت: شیعر دەربڕینێکی دڵنشینە لە دەرخستنی هەستێك کە مرۆڤ بەرامبەر جوانیەکانی سروشت‌و ژیان هەیەتی. ئەو پەیڤ‌و دەربڕینە ڕەنگە خاوەن کێش‌و قافیە بێت کە لەو حاڵەتە پێیدەگوترێ شیعری هەڵبەستراوو ڕەنگە نەشی بێت‌و وەك پەخشانی شاعیرانە دەربکەوێ. بەڵام (هەڵبەست) دەربڕینێکە هەڵبەستراو وەلێ تیایدا هیچ هەواڵێك لە دەرخستنی هەست‌و نەستی جوانکاری‌و جوانناسی‌و دەرخستنی سۆزو سۆزداری نییەو تەنها ڕەنگە لەخۆگری گێڕانەوەی ڕووداوێك یا باسکردنی پەندێکی حەکیمانە یا شتێکی دوور لە هەست‌و نەست بێت. لەو بارەیەوە غەزەلە جوانەکانی (سەعدی) و (حافز)و بەشێك لە پەخشانە جوانەکانی (گولستان)ی سەعدی‌و بەرهەمە پەخشانیەکانی تریان وەك نموونەی شیعرو (بوستان)ی سەعدی‌و شیعرەکانی تری گێڕانەوەو پەندو ئامۆژگاریان وەك نموونەی هەڵبەست

(نظم) دێنایەوە. شیعرێکیشمان لەو بارەیەوە گوایە لە مامۆستا (مەلیکولشوعەرای بەهار) هەیە کە دەفەرموێ:

(چ زۆرن ئەو شاعیرانەی لە تەمەنیاندا هەڵبەستێکیان نەوت

چ زۆرن ئەو هەڵبەستسازانەی لە تەمەنیاندا شیعرێکیان نەوت)

مامی خوالێخۆشبووم کە لەژێر ئەرکو چاودێری ئەودا لە تاران دەرسم دەخوێند، دکتۆرای پاسا بوو لە ئەڵمانیاو جگە لە زمانی کوردی کە زمانی زگماکی خۆی بوو، بە هەردوو زمانی فارسیو عەرەبیش کە زمانی خوێندنی بوون قسەی دەکرد، زمانەکانی تورکیو ئەڵمانیو فەرەنسیو ئینگلیزیشی بە باشی دەزانیو دەیگوت زمانی لاتینیش دەزانم. ئەو مرۆڤە زاناو خوێندەوارە کە قسەی ئەو بۆ منداڵێکی خوێندکاری وەك من بەڵگەی تەواو بوو، بەو هەموو زانستو خوێندەوارییەی کە هەیبوو حافزی بە شاعیر نەدەزانیو قسەشی ئەوە بوو کە یەکەمین شیعری ئەو شاعیرە لە (یەزیدی کوری معاویە) دزراوە. من کە هێشتا هۆشو ئاوەزێکی دروستو تەواوم نەبوو، پێموابوو مامم بەو هەموو زانستو زانیارییەی کە هەیەتی هەڵە ناکات، جگە لەوە ماوەیەکیش بوو کە لەژێر کاریگەریی نووسینەکانی خوالێخۆشبوو (ئەحمەدی کسرەوی) فێربوونەوەیەکم لە شیعرو شاعیری لەلا دروست ببوو، حەزم لە شاعیران بە گشتیو لە حافز بە تایبەتی نەبوو. دواتر کە بە هۆی خوێندنەوەو موتاڵاکردنی بەردەوامەوە، تێگەیشتم خوالێخۆشبوو کسرەوی دەربارەی شیعرو شاعیری زۆر بە هەڵەداچووە، دیسان ڕووم کردەوە شیعرو شاعیریو کەوتمە خوێندنەوەو موتاڵاکردنی شیعری شاعیرانی کۆنو وردە وردە دەریچەیەکم بە ڕوودا کرایەوە کە تا ئەودەم لێم داخرابوو. لەو دەریچەیەوە کەوتمە تەماشاکردنی باخی ڕازاوەو

شیعرو ئەدەبو تیایدا گوڵی بێ وێنە و بۆندارو جوانی وەکو حافزو سەعدیو باباتاهیرو خەیامو نیزامیو ئەوانی ترم بینی. لە بەرهەمی هەریەك لەو ڕەوانبێژانە بە قووڵی وردبوومەوەو دڵم بە حاڵی خوالێخۆشبوو کسرەوی سووتا کە چما بێ ئاگا لە دەرککردنی ئەو هەموو ناسکیو جوانیانە، دنیای بەجێهێشت.

بەڵێ، تا زیاتر چوومە پێش شەیداتر بووم، تا هێواش هێواش بوومە پەپوولەیەك بە دەوری مۆمی داگیرساوو بڵێسەداری حافزی شیرازی. ئەوکات زیاتر دڵم بە حاڵی مامم سووتا کە حافزی نەناسیو پەی بە ناسکی وتە جوانو بێ وێنەکانی ئەو پیاوە مەزنە نەبردو مرد. لەو کاتەدا بوو کە بە مانای دروستی وشەوە پەیم بە جیاوازیی نێوان شیعرو هەڵبەست برد کە لە خوێندنگە خوێندبوومانو بۆم دەرکەوت کە جوانترین ڕوخساری شیعر بریتیە لە غەزەلو جوانترین غەزەلی دنیاش ئەوانەن کە حافز دایناون. تازە تێگەیشتم کە ئەو شاعیرە وردبینو داهێنەرە بە چ وەستاییەکی سەیر ئێشو ئازارەکانی سەردەمی خۆی لە بۆتەی شیعرو لە قاڵبی غەزەلدا دەربڕیوەو چەندە لە بەکارهێنانی هێماو وشەی خوازراوی ناسكو دڵنیشندا شارەزاییو وەستایی کردووە.

بە بڕوای من حافز شاعیرێکە هەست ناسك، شیرین زمان، ڕۆشنبیر، دوور لە دەمارگیریو خورافات، بە هیممەت، دووربین، و لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر وشەناسو خوێندەوار، بە چەشنێك جاری وا هەیە کتێبێك لەنێو یەك بەیتە شیعردا کورت دەکاتەوەو هەموو غەزەلەکانی ئەوەندە ناسكو شیرینو پڕ تەنزو کینایەن کە هاوتایان نییە.

شەوێك لە كۆڕێكدا قسە لە غەزەلو لە حافز دەكراو كە ڕای منیان پرسی، یەكسەر گوتم حافز گەورەترین شاعیری دنیایە و بە ڕاستی شیعری جوانو غەزەلسەرایی بەوەوە كۆتایی هاتووە. یەكێك لە ئامادەبووان ڕەخنەی لەو قسەیەی من گرتو گوتی: ئەم قسەیەی تۆ نالۆژیكیانەیە، چونكە كەسێك دەتوانێ ئاوا قسەبكات كە شارەزای هەموو زمانەكانی دنیا بێت، هەموو شاعیرانی دنیا بناسێو شیعرەكانی هەمووانی لەگەڵ یەكتر بەراورد كردبێتو ئینجا ئەو جۆرە حوكمە بدات، بێگومان بەڕێزت ناڵێی كە شارەزای هەموو زمانەكان بیتو هەموو شاعیرەكانی جیهان بناسیت. گوتم هیچ بە پێویستی نازانم كە هەموو زمانەكانی دنیا بزانمو هەموو شاعیرانی دنیا بناسم، چونكە ئەوەندە بەسە كەمو زۆر لەگەڵ ناوی شاعیرانی گەورەی جیهان ئاشنابمو بە ڕێكەوت لە ڕێی زمانی فەرەنسیەوە ئەو ئاشناییەم لەگەڵ بەرجەستەترین شاعیرانی دنیادا هەیەو شیعرەكانیانم بە زمانی فەرەنسی یا وەرگێڕدراو بۆ زمانی فارسی خوێندونەتەوەو لەگەڵ شیعرەكانی حافزدا بەراوردم كردوون. هەر (گۆتە)ی فەیلەسوفو شاعیری گەورەی ئەڵمانی، كە دەشێ بە (مەولەوی) خۆمان بەراوردی بكەین، لە ڕێی زمانی عەرەبیەوە لەگەڵ حافزدا ئاشنا دەبێو غەزەلە شیرینەكانی ئەو شاعیرە پایەبەرزە ئەوەندە سەرنجی ڕادەكێشن كە دەڵێ: "من ئەگەر لە سەردەمی حافز دەبووم شانازیم دەكرد كە یەكێك لە شاگردەكانی قوتابخانەی ئەو بووام". جا ئەو عەشقو خولیایەی ئەو بۆ حافز لە ڕێی وەرگێڕانە عەرەبیەكەی دیوانەكەی بووەو ئەگەر ئاشنای زمانی فارسی بووایەو حافزی بە فارسی خوێندبووایەوە مسۆگەر شێتو شەیدا دەبوو، چونكە تەنها حافزە كە مایەی وەرگێڕان نییە بۆ هیچ زمانێكو وەك (نازم

حیکمەت) دەڵێ هەرکەس بیەوێت حافز بۆ زمانێکی تر وەربگێڕێو بیەوێ جوانکاریەکانی شیعرو وشەکانی ئەو بە زمانی وەرگێڕانەوە لە ئەوانی تر بگەیەنێ تەواو وەکو ئەوە وایە کە بولبولێکی لە پێناو گۆشتەکەیەوە کوشتبێ، چونکە بولبول هەمووی ئاوازو چریکەیەو گۆشتێکی نییە کە بۆ خواردن ببێت. یا بە واتەی سێرڤانتس لە دۆن کیشۆتدا، وەك ئەوە وایە کە لە پشتەوە سەیری مافوورێکی زۆر جوانو خۆش نەخشو نیگاری ئێرانی بکەیت، کە هەڵبەتە سنوورو هێڵەکانی نەخشەکە دەبینرێن وەلێ ئەو ڕەنگ ئامێزیو ناسککاریانەی نەخشو نیگاری مافوورەکە بەدی ناکرێن.

بەڵێ "گۆتە" شاعیری گەورەی ئەڵمانی، لەبەر خولیاو خۆشەویستیی زۆری بۆ حافز بە لاساییکردنەوە لە حافز دیوانێکی نووسی بە ناوی "دیوانی رۆژهەلات ڕۆژئاوا" کە لە ئەورووپا ناوبانگێکی زۆری پەیداکردو ڕێزدار (شوجاعەددینی شیفا) کە خۆیشی وەرگێڕێکی بەرجەستەیە، وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی. ئەو شیعرانە بە بەراورد لەگەڵ غەزەلە شیرینو بەرزەکانی حافزدا بێ زیادەڕۆیی وەك مووروی بێ بەها وان کە لە بەرامبەر مرواریدا دانرابن، و من دەتوانم بڵێم جوانترین شیعری بەناوبانگی جیهانیم بە زمانی فەرەنسی خوێندوونەتەوەو لە بەرامبەر شیعرەکانی حافزدا لە ئاستێکی زۆر نزمم بینیوون.

خۆشبەختانە چەند کەسێك لە ئامادەبووانیش پشتیوانیان لە قسەکانی من کردو لایەنگریان لە حافز نیشان داو شیعرەکانی ئەویان لە دنیا کە هیچ لەنێو شاعیرانی پارسی زمانیشدا بێهاوتا زانی. ئینجا من ئاماژەم بە خاڵێکی تر کردو نموونەیەکی ترم هێنایەوەو گوتم زانایانی زانستە سروشتیەکان پێیانوایە کە زەوی لە قۆناغی سێیەمی زەویناسیدا ڕووچوونێکی گەورەی

تێکەوتووەو لە ئەنجامی ئەوەدا چیای (هیمالایا) کە بەرزترین لوتکە چیای جیهان لەوێدایە، دروست بووە. ئەو بوویەرە لە قۆناغی سێیەمی زەویناسیدا واتە ملیۆنان ساڵ پێش هەنووکە ڕوویداوەو جارێکی تر هەرگیز هەلومەرج و ڕەوشێکی ئاوا بۆ گۆی زەوی دروست نابێتەوە کە جارێکی دیکە دیسان ڕووچوونێکی وەکو هی ئەو سەردەمە لە زەویدا ڕووبداو لوتکەیەکی وەکو "ئەڤەرێست" دروست ببێتەوە. دنیای ئەدەبیش لەژێر هەلومەرج و بارودۆخێکی تایبەتی کۆمەڵایەتیدا جارێك ڕووچوونێکی گەورەی تێدا دروست بوو و لوتکەیەکی بەرزی بە ناوی (حافز) هێنایە ئارا کە ئیدی وێنەی نابێتەوە چونکە ئەوە ڕەوش و هەلومەرجەی سەردەمی حافز ناهێتەوە کە شاعیرێکی ئاوا دروست بکاتەوە.

یەکێك لە ئامادەبووان کە پیاوێکی قسەخۆش بوو ئاگای لە خولیای من هەبوو بۆ حافز، پرسی: فلانی، گریمانەی مەحاڵ مەحاڵ نییە. وامان دانا کەوا ئێستا حافز زیندوو بۆتەوەو خەریکە بەرەو ئێرە دێ، کاتێ گەیشتە ئێرە تۆ چی دەکەیت؟ پرسیارەکەی گەوجانە بوو وەلێ بەهەرحاڵ پرسیار بوو دەبوا وەڵامی بدرێتەوە.. گوتم: هەڵدەستم، دەچمە پێشوازی و دەپرسم حافزی هێژا، نۆکەرت ناوێ؟ مسۆگەر دەڵێ: من پارەی گرتنی نۆکەرم نییە، ئەنجامدانی ئەرك هەقدەستی گەرەکە. پێی دەڵێم، قوربانت بم، پێویست بە پارەدان و ئەو شتانە ناکات، من ئامادەم بێ هەقدەست و بێ پارە خزمەتی بەرێزتان بکەم. ئامادەبووان قاقا پێکەنین و تێگەیشتن کە خولیاو خۆشەویستی بەندەی ناچیز سەبارەت بەو خواجە مەزنە تا چ ڕادەیەکە.

لە گاڵتە دەرچێ تەنها بە قووڵبوونەوە لە شیعرەکانی حافز دەتوانین پەی بەوە ببەین کە ئەو پیاوە مەزنە لەو سەردەمە ڕەش و پڕ لە ستەم و

قەیرانەی کە تیایدا دەژیا، واتە سەردەمێکی وەکو سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا کە چاودێریکردنە سەر بیروباوەڕەکان زۆر بە توندی ئەنجام دەدرا ئەو بە شیعرە ناسكو پڕ لە تەنزو هێماکانی خۆی بە جوانترین و پوختەترین دەربڕین ڕەخنەی لە ڕیاکاران و فێڵبازان گرتووەو شانی داوەتە بەر هۆشیارکردنەوەی خەڵك لە بەرامبەر ئەفسوونگەری و فریوو هەڵخەڵەتاندنیان.

با ئاماژە بە دوو ڕای تر سەبارەت بە حافز بدەم کە هەردووکیان سەرنجڕاکێش و شایانی گوێ لێگرتنن و مخابنە کە لێرە باس نەکرێن، یەکەمیان هی خوالێخۆشبوو (محەممەد عەلی فروغی)یە کە حافزو سەعدی پێکەوە بەراورد دەکردن و دەیگوت گەورەیی سەعدی وەکو گەورەیی چیا وایە کە بەرزەو سەرکەشەو نزمایی و بەرزایی زۆری هەیە و ئەو بەرزایی و نزماییانە بەرچاون و شاراوە نین، بەڵام گەورەیی حافز لە دەریا دەچێ کە سافو یەکدەستو قووڵە، بەڵام دوڕو مرواریدو مەرجان و ناواخنە گرانبەهاو دەگمەنەکانی تری بە چاو نابینرێن و پێویستە غەواس بیت و ژێر ئاوان لێبدەیت تا بتوانی ئەو جەواهیرە نایابانە وەدەست بێنێ.

ئەوەی تریان لە پیاوێکی ئایینیەوەیە بە ناوی سەیدا (موهاجرانی) کە لە پرسەی یەکێ لە ئاشنایاندا، لە خانەقای (سەفیعەلیشاە) چووبووە سەر مینبەرو دوای باسکردنی چەند بابەتێك قسەی هێنایە سەر حافزو سەعدی و لە بەراوردکردنی ئەو دوو پیاوە مەزنەدا قسەیەکی سەرنجڕاکێشی کرد کە قەت لە بیرم ناچێ، گوتی: بەڕێزان، دەزانن جیاوازی سەعدی و حافز لە چیدایە؟ سەعدی زانایەکە کە ئەگەر شێتێك شیعرو بەرهەمەکانی بخوێنێتەوە بە هۆش دێتەوەو عاقڵ دەبێتەوە، وەلێ حافز ئەو پیاوە

زیرەکە عاشق پیشەیە کە ئەگەر عاقڵێك غەزەلە دلگیرەکانی بخوێنێتەوە دڵ‌و دین لەدەست دەداو شێت دەبێ. دوای ئەوە بە ئاوازێکی دڵنشین یەکێك لە غەزەلەکانی ئەوی ئەوەندە جوان خوێندەوە کە جۆش‌و خرۆشی خستە نێو کۆڕی پرسەگێڕەکان. بڕیارم وابوو کە پرسەکە تەواو بوو ڕاکەم لە بری ئەو وتارە نایاب‌و دلگیرەی دەستی ماچ بکەم، بەڵام مزگەوتەکە قەرەباڵغ بوو تا من توانیم بچم ئەو ڕۆیشتبوو. (زەریفی)یش دەیگوت تەنها بەدشانسی سەعدی ئەوە بووە کە دوابەدوای ئەو شاعیرێك هاتووە بە ناوی حافزو ئەوی خستۆتە ژێر سێبەری ناوبانگی خۆیەوە.

پ: حەزت لە شیعری کام یەك لە شاعیرە هاوچەرخەکانە؟

و: ئەگەر مەبەست (هاوچەرخ) سەردەمی دوای شۆڕشی (مەشروتیەت) واتە هەفتا هەشتا ساڵی بەر لە ئێستا بێت، جگە لە (مەلیکوالشوعەرای بەهار) کە بێگومان مامۆستای بێ چەندوچوونی شیعری فارسی دوای شاعیرانی کۆنە، زۆر خولیای (ئیرەج میرزا)م چونکە ئەو سادەکاری‌و داهێنانەی کە دەربارەی ڕەوانی شیعرەکانی سەعدی گوتراوە، بێ کەم‌و زیاد سەبارەت بە شیعرەکانی ئەویش ڕاستن. جگە لەوەش، لە شیعرەکانی ئەودا کۆپلەی واش هەن کە تیایاندا بەرپەرچدانەوەو دژایەتیکردنی خورافات‌و خەیاڵپەردازی‌و هاندان‌و دەست لە پشتدان بۆ واقیعگەرایی‌و بیرکردنەوەی چاك بەدی دەکرێن. بە مانای دروستی وشەوە، (مەسنەوی) زوهرەو مەنوچێهر)ی ئەو، شاکاری شیعری فارسی‌و لە ترۆپکی جوانی‌و ڕەوانی دایە. ئیرەج لاسایکەرو شوێن پێهەلگریشی هەن بەڵام بێگومان هیچ کامیان نەگەیشتنە ئاستی ئەوەوە.

بەڵام ئەگەر مەبەست لە (هاوچەرخ)، شاعیرانی نوێخواز بێت کە لەگەڵ سەردەمی ئێمەدا هاوکاتن‌و هێشتا مەرەکەبی شیعرەکانیان وشك نەبۆتەوە، من حەزم بە (نادری نادرپور)ە، چونکە لە شیعرەکانی ئەودا ئاماژەگەلێکی بەرچاو لە شیعر بە مانای ڕاستەقینەیەوە بەدی دەکەم کە لە شیعری کەمتر شاعیرێکی تر بینیومە. ئەوەندە بەسە کە چاوێك بە شیعری (ترێ‌و بتتراش‌و گێوماتای ئاسمان‌و چرایەك لە پشت قەمیشەلانەکە)ی ئەودا بخشێنی‌و ببینی کە چ بابەتگەلێکی تازەو جوانی لە قاڵبی شیعردا داڕشتوون. بەهەرحاڵ هەڵبژاردەیەك لە شیعرەکانی ئەو لە ساڵی ١٩٤٧ تا ١٩٧٧ بۆ جاری پێنجەم لە ١٩٧٩ چاپیان کردەوە بخوێنەوە تاکو ڕاستی قسەکانمت بۆ دەربکەوێ.

پ: خوێندوومەتەوە، خراپ نییە. ئایا لە شیعردا، گەڕانەوە بۆ شێوازەکانی ڕابردوو، کارێکی پێویست یا نابەجێ‌و دروستکراوە؟

و: من لەگەڵ هیچ کام لەو دوو قسەیەی تۆ هاوڕا نیم، واتە گەڕانەوە بۆ شێوازەکانی ڕابردوو نە بە کارێکی پێویست‌و حەتمی دەزانم کە بە هیچ ڕێیەکی جیا لەوە قایل نەبم‌و نە پێشم وایە نابەجێ‌و دروستکراوە. بە واتایەکی تر لە لایەکەوە نەدەتوانم پەروەندەیەکی درەوشاوەی وەك پێشینەی دێرینی شیعری کلاسیکی فارسی کە لە ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەیدا چەندین خۆری تیشکاوێژی وەك (فردەوسی) و (رودەکی) و (فەڕوخی) و (ئەنوەری) و (نیزامی) و (سەعدی) و (مەولانا) و (حافز) و (سائیبی تەبریزی) دەدرەوشێنەوە، بە یەکجاری بخەمە لاوەو ئەو مرۆڤە مەزنانە فەرامۆش بکەم‌و بڵێم شیعرگوتن بە شێوازی ئەوان ئیدی کۆن بووەو بمانەوێ یان نا دەبێ ڕێگایەکی تازە بگرینە پێش سەبك‌و شێوازێکی نوێ

هەڵببژێرین، وەك چۆن لە سەردەمی مەشروتیەت بە دواوە هەندێ کەس بە پێشەنگی (نیما) ئەو کارەیان کرد. نە ئەو حوکمەش دەدەم کە بە سەبك‌و شێوازێك جگە لە سەبکی شاعیرانی کۆن نابێ شیعر بنووسرێ‌و داهێنانێك ئەنجام بدرێ، نَە، من شیعرگوتن بە هەردوو شێوازو سەبك بە ڕەواو ڕاست دەزانم بەو مەرجەی کە شیعر بێت‌و ماناو نێوەڕۆکی هەبێ‌و دەربڕی ئێش‌و ئازارو هەست‌و ئەستەکان بێت‌و خوێنەر کە دەیخوێنێتەوە بتوانێ ماناکانی دەرك بکات‌و هەروەها خۆش ئاوازو خۆش ئاهەنگیش بێت تا بتوانی هەستی شیعربوونی تێدا بکەیت، ئەگەرنا بە ڕای من هەر گوزارەو دەربڕینێکی بێ کێش‌و قافیەو تێکەڵ‌و پێکەڵ ناکرێ بە شیعر بزانین.

(شیعر دەبێ ئەوای گیان بێ

پەیکێك لە دڵەوە بەرەو زمان بێ)

پ: نیماو شیعری چۆن دەبینی؟

و: نیما بێگومان یەکێك لە گەورەترین‌و پێشەنگ‌و پەرچەمداری شیعری نوێیە لە زمانی فارسیداو یەکەمین کەسە کە زاتی ئەوەی کردووە قاڵبەکان بشکێنێ‌و کۆت‌و بەندەکانی کێش‌و قافیە بپچڕێنێ‌و هەرچی دڵی تەنگی بیەوێ بڵێ، و هەر ئەو کارە بۆ خۆی کارێکی بچوك نییە و بوێری‌و ئازایەتییێکی زۆری دەوێ تا کەسێك ئەوە بکات. بەڵام لێرەدا دوو پرسیار بۆ خودی خۆم دێنە پێشەوە کە بۆ کەسانی تر گشتگیریان ناکەم‌و حەزم لێبوو بمتوانیایە وەڵامێکی ڕازیکەرانەی هەردوو پرسیارەکە بدەمەوەو دڵی خۆم ئاسوودە بکەم.

پرسیاری یەکەم: ئایا نیما لەو کارە بوێرانەیەی خۆیدا سەرکەوتوو بووە؟ هەروەك چۆن گوتم ئەم پرسیارە پەیوەندیی بە خۆمەوە هەیە

وەڵامەکەشی ڕاست یا چەوت پەیوەستە بە خۆمو ئەوانی تر بە هیچ شێوەیەك پابەند نین بە قبوڵکردن یا پەیڕەویکردن لێی. بە بڕوای من نیما لە حاڵەتێکدا لەو کارەیدا سەرکەوتوو دەبوو کە شیعرەکانی لەخۆگری ناوەڕۆكو واتاگەلی تازەو دەستی یەکەم بووانو ئەو واتاو ناوەڕۆکانەی بە وشەو دەربڕینێکی ڕەوانو جوانو بە گوزارشتێکی ڕۆشنو مایەی تێگەیشتن خستبانە ڕوو. من خۆم زۆر لە شیعرەکانی ئەو پێشڕەوە مەزنە دەبێ چەندین جار بخوێنمەوە تا بتوانم بە مەزەندەو گومان واتایەکیان لای خۆم بۆ وێنا بکەمو بە مەزەندەو لێکدانەوە خۆم ڕازی بکەم بەوەی کە بڵێم دیارە شاعیر ویستویە ئەو شتە بڵێ، ئینجا کاتێکیش بە خەیاڵی خۆم مانای شیعرەکەم دۆزیەوە، هیچ چەشنە تامو چێژو ناسکیو جوانیەکی تێدا بەدی ناکەم.

پرسیاری دووەم: ئایا لاساییکەرانی نیما سەرکەوتوون؟ دەتوانین لاساییکەرەکانی نیما بە دوو گروپ دابەش بکەین: گروپێکیان ئەوانەی کە وەکو خودی نیما بە یەکجاری کۆتو بەندە کۆنەکانیان پچڕاندووەو لە ناڕۆشنیو بێ بەندو باریدا لە خودی نیماش تێیانپەڕاندووە. ئەو کۆمەڵە کە گەورەپیاوانی وەکو (سۆهرابی سپێهری) و (یەدوڵڵای ڕوئیایی) و (ئەحمەدی شاملۆ) و هیتر لەخۆ دەگرێ، پێموابێ خۆیان سەر بە نەوەیەکی دوای خۆیان دەزاننو بۆیە شیعرەکانیان بۆ نەوەیەکی دوای خۆیان دادەنێنو بە لایانەوە گرنگ نییە کە نەوەی ئێستا شتێك لە شیعرەکانیان تێبگاو لەوانەشە نەوەی ئەمڕۆ شایستەی ئەوە نەبینن کە بۆ تێگەیشتنی ئەو شیعر بڵێن. ئاخر من تێناگەم کە سۆهرابی سپێهری لەم شیعرەدا ویستوویە چی بڵێ:

(کورسی لە نێوان وشە سەوزە ئەستێرەییەکان دابنێ،
ئەی دەمی پڕ لە دیمەن!
گەڵای هەنجیری تاریکی،
هەفت بەرد بڵاو دەکاتەوە).

گروپی دووەم ئەوانەن کە نە پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ ڕابردووی پڕ لە شانازی ئێمەوە بڕیوە، نە لە دانانی شیعری کێشدار، بەڵام کورت‌و درێژو بێ قافیە دەپرینگێنەوەو نە شیعرێك دادەنێن کە بێمانا بێ‌و کەس شتێکی لێ تێنەگا. من لە شیعری ئەوانەی دواییدا کە (نادری نادرپوور) و (فەرەیدونی موشیری) لە سەرووویانەوەن شیعری زۆر جوانم بینیون‌و خوێندومنەتەوە کە بە ڕاستی چێژم لێ وەگرتوون.

بەهەرحاڵ، ساڵحی هێژا، ئەوەی لەو بارەیەوە گوتم، تێڕوانینێکی تایبەتی خۆمە کە بە هۆی حەزو ئارەزووی لە ڕادەبەدەری خۆم بە شیعری کۆنەوە ئەو تێڕوانینەم لەلا دروست بووەو بە هیچ جۆرێك بەڵگەو بەهایەکی حەتمی بۆ کەسانی تر نییە.

پ: بۆ یەکەمین جارە، شاعیرێك لە ئێران، واتە (ئەحمەد شاملو) بۆ خەڵاتی نۆبڵ کاندید دەکرێ، ئەو کارە چۆن دەبینی؟ ئایا خەڵاتی نۆبڵ نەگۆڕاوە بۆ ئامرازێکی سیاسی؟ ئایا هێشتا بەهاو نرخێکی ماوە؟

و: لەوەی کە خەڵاتی نۆبڵ بۆتە ئامرازێکی سیاسی لە دەستی کەسانێك کە لە دنیادا بە قازانجی ئوردوگایەکی دیاریکراوو بە زیانی ئوردوگای دژیەوە کاردەکەن گومانێك نییەو من جارێك لەو بارەیەوە وتارێکم لە گۆڤارێکی بیانیەوە بۆ بەڕێز (باقرزادە) بەڕێوەبەری چاپەمەنی (تووس) وەرگێڕا کە ئەو بابەتەی بە درێژی شەن‌و کەو کردبوو و بڕیار بوو وتارەکە

لە بڵاوکراوەیەکی مانگانە کە لە لایەن دەزگای چاپەمەنی (تووس) بڵاودەکرایەوە، چاپ بکرێ. پێدەچێ ئەو بڵاوکراوەیە دەرنەچووبێ بۆیە ئەو وتارەش چاپ نەکرا.

بەڵام ئەوەی کە ڕێزدار شاملو بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ کاندید کراوە منیش نازانم کێ بەرپرسیانی کاندید کردووەو لەسەر چ بنەمایەك کاندید کراوەو لەبەرچی خەڵاتەکەی پێنەدراوە. بەهەرحاڵ پێموانییە ئەو ناوزەدکردنەی بۆ خەڵاتی ناوبراو بۆ شیعرەکانی بێ، لەوانەیە کە بۆ وەرگێڕانی بێت، چونکە من شاملو لە ڕیزی وەرگێڕە زۆر باشەکان دەزانم، وەك چۆن وەرگێڕانی کتێبی (پێ خاوسەکان) و (مەرگ کەسبو کاری منە) ئەو خاڵەی بۆ من ساغ کردۆتەوە، وەلێ چونکە شتێك لە شیعرەکانی تێناگەم، ناتوانم بڕیارێك سەبارەت بە شیعرەکانی بدەم. هیوادارم ئەو وتە پڕ واتایەی (نیچە)، ئەو و نارۆشن بوونی ئەو نەگرێتەوە کە دەڵێ (ڕووبارە بچوكو تەنکاوەکان بۆیە ئاوی خۆیان شێلوێ دەکەن تا نەزانرێ قووڵاییێکی ئەوەندەیان نییەو بنیان دیارە).

پ: با بچینە سەر ڕۆمان. ڕۆمان مانای چییە؟ و ئایا لە ئێرانی ئێمەدا -ڕۆمان- لە دایك بووە؟

و: ڕۆمان بە بۆچوونی من چیرۆکێکی خەیاڵیو دروستکراوە کە لەسەر پایەی ژیانی ڕاستەقینەو واقیعی خەڵکی نێو کۆمەڵگەیەك دەنووسرێو بە واتایەکی تر خەونو خەیاڵێکە کە بۆی هەیە ببێتە ڕاستی. کاری ڕۆماننووس یەکێکە لە ڕشتەکانی ئەدەب کە لە ئەدەبیاتی کلاسیکی ئێمەدا پێشینەی نەبووەو ئێمە لە سەردەمی دوای (مەشروتیەت) بەدواوە لە ئەورووپاییەکان فێری بووین. بەمپێیە ڕۆماننووسین لە ئێران منداڵێکی

ساوایە و هێشتا پێنەگەیوە وەلێ بە دڵنیاییەوە لە قۆناغی گەشەو پێگەیشتندایەو لەو ڕۆمانانەی کە تا هەنووکە لە ئێران بە پێنووسی نووسەرانی بە سەلیقەو بەتواناوە نووسراون‌و بڵاوکراونەتەوە دەتوانین ئومێدەوار بین کە ئەو کۆرپە یەکشەویە و خەریکە بە ڕێگەی سەد ساڵەدا دەڕوا. من لەو ڕووەوە زۆر گەشبینم‌و بە پێچەوانەی شیعری نوێن کە ئەویش بە ڕای من لاساییکردنەوەیە لە ئەوروپاییەکان‌و هیچ نەکەوتۆتە بەر دڵم، لەو ڕۆمانانەی کە تا ئێستا بڵاو کراونەتەوەو خوێندوومنەتەوە ئەو ئومێدەم هەیە کە بە زوویی نووسەرانی گەورەی وەکو نووسەرانی ڕۆژئاوا لە ئێرانی ئێمەشدا دروست ببن‌و وەپێش گەورەترین پێشەنگە ئەوروپاییەکانی خۆیان بکەونەوە. ئەو لاوانەی کە لەو ڕێگایەدا هەنگاوی گەورەیان هەڵێناو گەیشتوونەتە ئاستێك کەم نین، و ئێوە خۆشتان وەك ئاگاداری یەکێکن لەوانە کە ئومێدی ئایندەیەکی درەوشاوەتان لێدەکرێ.

پ: مامۆستا! خۆتان پێشوازیتان لە چ ڕۆمانێك‌و کام لە ڕۆماننووسەکان کردووەو دەکەیت؟

و: دۆستی خۆشەویست، ئێوە خۆتان دەزانن کە من کتێب سازم نەك کتێب خوێن‌و ئەگەر وەرگێڕان، وەختێکم بۆ کتێب خوێندنەوە بۆ بهێڵێتەوە ئەوا بۆ خوێندنەوەی کتێبە فەرەنسیەکان تەرخانی دەکەم تا یەکێکیان بۆ وەرگێڕان هەڵبژێرم‌و وەك چۆن زۆرجار وا ڕێك کەوتووە سی کتێبم خوێندۆتەوە تا یەکێکیانم کەوتۆتە بەردڵ‌و بۆ وەرگێڕان هەڵمبژاردووە.

بەڵام هەندێ جاریش لەسەر ڕاسپاردەی برادەرەکانم کتێب‌و ڕۆمانم خوێندونەتەوەو چێژم لە هەندێکیان وەرگرتووە. لە یەکەمین ڕۆمان کە

دوای خوێندنەوەی چەندین ڕۆمانی فارسی چێژێکی زۆرم وەرگرت‌و زۆر مایەی پەسندمە، ڕۆمانی (دراوسێکان)ی (ئەحمەد مەحموود) بوو کە بە ڕاستی چێژم لە خوێندنەوەی وەرگرت‌و لە بیرمە کە لە خوێندنەوەی بوومەوە لە خوارەوەی دوا لاپەڕەیدا نووسیم: "زۆر باش بوو! ڕۆمانێك کە شان لە شانی رۆمانە باشەکانی ڕۆژئاوا دەدات‌و هیچی لەوان کەمتر نییە! ئافەرین بۆ نووسەرەکەی!". دوای ئەوە، باشترین رۆمان کە بە ڕاستی مەستی کردم‌و چێژێکی زۆرم لە خوێندنەوەی وەرگرت "دەرکراوی دەستی ستەم" بوو، شاکارێکی بێوێنە بوو کە لە پەراوێزی ئەویشدا دوای خوێندنەوەی نووسیم: "نازانم چی بڵێم، چونکە لە وێناکردنی ئەم کتێبەدا هەرچی بڵێم، کەمم وتووە. بە ڕاستی شاکارەو من نەك هەر لە ئەدەبی هاوچەرخی فارسی، لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاواشدا هاوتایم نەخوێندۆتەوە.."

پ: تێڕوانینتان دەربارەی (مەحمودی دەوڵەت ئابادی) چییە؟ ئایا ڕۆمانی "کلیدەر" بە بەراورد بە ڕۆمانی "جێی خاڵی سلوچ" ڕۆمانێکی نزمتر نییە؟

و: من (مەحمودی دەوڵەت ئابادی) بە نووسەرێکی باش‌و خاوەن توانا دەزانم، لە ڕیزی ئەوانەی کە گوتم ڕۆژێك دەبنە نووسەرانی گەورەی جیهانی، بەڵام بە داخەوە کتێبی "کلیدەر"ی ئەوم نەخوێندۆتەوەو ناتوانم لە بارەیەوە ڕای خۆم دەرببڕم. بەهەرحاڵ سەلیقەکان لێك جیان‌و من بە پێچەوانەی بۆچوونی بەڕێزتان لە کەسانێك کە کەم‌و زۆر بێ توانا نین بیستوومە تاریف‌و پەسنی ئەو کتێبەیان کردووە.

پ: ڕۆماننووسانی وڵاتی ئێمە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، ئایا هۆیەکەی خێرا تێپەڕبوونی بوویەرو ناوەڕۆکەکانە لە کۆمەڵگەی ئێمە، یا ڕۆماننووسانی ئێمە بێ هێزو سستن؟

و: ڕۆمان ئاوێنەیەکە لە ڕەوتو ڕووداوەکانی ژیان کە لە وڵاتێك یا کۆمەڵگەیەك ڕوودەدەنو تا خێرایی ڕەوتی ئەو ڕووداوانە زیاتر بێت ڕەوتی ڕۆمانەکانیش خێراترو جۆرەکانیان جیاجیاتر دەبێت. لە کۆمەڵگەی ئێمەشدا ڕووداوەکان خێراو زوو تێپەڕنو بابەتو ناوەڕۆکگەلێکی زۆر باش بۆ نووسینی ڕۆمان دەخەنە بەردەست، وەلێ لەبەر دوو هۆکار هێشتا وەك پێویست ڕەوتی ڕۆمانەکانی ئێمە نەگەیشتۆتە ئاستی ڕەوتی ڕۆمانە بیانیەکان.

هۆی یەکەم، پێشتر باسم کرد کە تەمەنی چیرۆكو چیرۆکنووسی لە وڵاتی ئێمەدا هێشتا زۆر کەمەو هونەری ڕۆماننووسین دوای شۆڕشی (مەشروتیەت) لە ئێران لەدایك بوە، بۆیە ناتوانین چاوەڕوانی ئەوە لە منداڵێکی ساوا یا گەشەکردنیشی خێرابێ بکەین کە بە شەوێك ڕێی سەد ساڵە تەی بکات. هۆی دووەم، نەڕەخسانی بواری نووسەرانە کە لەژێر چاودێریو سانسۆرداننو ناتوانن هەرچی دەیانەوێ بینووسن. هەر کاتێك ئەو ئازادیەی ئەندێشەو زمانو قەڵەم لێرەشدا وەکو وڵاتانی ئازادی جیهان باوی سەند دەبینی کە مەودای بەجێمانمان دەبڕینو خۆمان دەگەیەنینەوە ئەوانەی کە لە پێش ئێمەدان.

پ: من لە "ئاوازی کوژراوەکان"ی (ڕەزا بەراهەنی)دا ڕۆشنایەکم بینوە، کە دەتوانێ ئومێدێك بێ، بەڕێزت ئەو ڕۆمانەت خوێندۆتەوە؟

و: ڕاستە کە ڕۆمانی "ئاوازی کوژراوەکان"ی بەڕێز (ڕەزا بەراهەنی)م نەخوێندۆتەوە، بەڵام چونکە لە تواناو زەوق‌و سەلیقەی ئەو بێ ئاگا نیم‌و دەزانم کە کەسێکی شتزان‌و خوێندەوارەو هەروەها لەگەڵ زەوق‌و توانای تۆشدا ئاشنام دڵنیام کە زیادەڕۆیی ناکەیت‌و چاوە تیژبینەکانی بەڕێزت ئەو ڕۆشناییەی باش بینیوە. جگە لەوەش، مەگەر نەمگوت دەبێ ئومێدەوار بین‌و مەگەر ئەو کۆرپە تازە وەبێ کەوتووەی ڕۆماننووسین خەریکی گەشەو پێگەیشتن نییە؟ کەوایە جارێکی تریش دووپاتی دەکەمەوە کە ئایندەیەکی درەوشاوەمان لەو ڕووەوە لە پێشدایە و ئەگەر منیش نەیبینم، ئێوە دەیبینن، پەنا بە خوا!

پ: لەنێو نەوەی مندا، هەندێ دەنگی نادیار و گومناو لەو ڕێڕەوەدا چوست‌و چالاکانە کاردەکەن، و کەم تا زۆر دەستنووسەکانیانم خوێندوونەتەوە، ئەگەر پێگەو بوار و دەرفەتێکیان بۆ برەخسێندرێ، زۆر وەپێش ئەوانەی پێش خۆیان دەکەونەوە، بەڵام ڕێوشوێن‌و بواری چاپ‌و بڵاوکردنەوەو پرس‌و پەیوەندییە زاڵەکانی سەر بڵاوکەرەوەکان، دەبێتە مایەی نائومێدی‌و چاوەڕوانیی ئەو نەوەیە.. بۆ ئەمە چ پێویستە بکرێ؟ چۆن سەیری ئەو ئومێدانە دەکەیت؟

و: دەستخۆش! وا ئێستا هاتیە سەر قسەی من. بەڵێ لەنێو ئێوەدا دەنگ‌و ڕەنگی گومناوو نایار زۆرن کە وەك خۆت دەڵێی، لەو بوارەدا چوست‌و چالاکن. تەنها ئەوەندە بەسە کە مەیدان‌و کەش‌و هەوایەکی گراوەیان بۆ دابین بکرێ تا زەوق‌و سەلیقە و توانا تاکە کەسیەکانی خۆیان لە هونەری نووسیندا نیشان بدەن‌و دیسان وەك خۆت فەرمووت وەپێش

ئەوانەی پێش خۆیان بکەونەوە. بەڵام هەروەك خۆت ئاماژەت پێدا کۆسپ‌و ئاستەنگێکی زۆریان لە پێشدایە کە دەبێ وردە وردە وەلا بندرێن.

کۆسپی یەکەم ناسراو نەبوونیانە کە بە داخەوە چونکە لەم وڵاتەدا تەرازووی هەڵسەنگاندنی زۆربەی بڵاوکەرەوەکان پارەو دەسکەوتی ماددیە و تا دڵنیا نەبن کە لە چاپکردنی کتێبێك قازانجی پێویست دەکەن، یا لانی کەم زەرەری لێناکەن ئامادە نابن چاپی بکەن. نەناسراوی نووسەرەکەش ئەو بەدگومانیە زیاتر دەکات. بەڵام ئەو لاوە بەهرەمەندانە نابێ سارد ببنەوەو نابێ دەست لە کاری خۆیان بکێشنەوە بەڵکو دەبێ بەوپەڕی منجڕی‌و پێداگریەوە، بە هۆی کەسانی تر یا بێ ئەوە، خۆیان بگەیەننە لای بڵاوکەرەوەکان تا نیشانی بدەن کە نووسینەکەیان نووسینێکی بێ سوود نابێ. مەگەر خودی من‌و تۆ ئاوامان نەکرد؟ من دوو ساڵ ڕاکەڕاکم کرد تا تێمگەیاندن کە کارەکەم خراپ نییە و تۆش کەمتر لەو ماوەیە.

بە هەرحاڵ دەستت لە هەوڵدانی خۆت هەڵنەگرت‌و ساردنەبوویتەوە، بە هەمان شێوەی من.

گرفتی دووەم ڕەوشی زاڵ‌و داسەپاوی سەر بڵاوکەرەوەو نووسەرەکانە کە لەگەڵ ئەویشدا دەبێ بە حەوسەڵە و سەبرو خۆڕاگریەوە هەڵسوکەوت بکەین‌و نائومێد نەبین. لە بیرتان نەچێ کە ژیان تێکۆشانەو دەبێ چالاکانە تێبکۆشین‌و وەك (حەنزەلەی بادغیسی)ی شاعیر دەڵێ خۆ بخەینە مەترسیەوە:

(گەر مەزنایەتی لە دەمی شێری دڕندەدایە

برۆ خۆت بخەرە مەترسی لە دەمی بێنەدەر)

من ئامۆژگاری ئەو لاوانە دەکەم کە بەو بەربەستە سەرەتاییانە دڵسارد نەبنەوەو کۆڵ نەدەن، و ئەگەر بۆیان کرا بە هۆی ڕێنوێنیو هاوکاری کەسانی خاوەن قەڵەم کە ناو و ناوبانگێکیان هەیە، خۆیان بەو بڵاوکەرەوە حسابگەرانە بدەنە قبوڵکردنو ڕێی پێشکەوتن بکەنەوە. کاتێك کە لەو ڕێگایەدا سەرکەوتنیان وەدەست هێنا، خۆشیان دەبنە ڕێنوێنیکەرو ڕێکەرەوە بۆ لاوانی خاوەن توانای نەوەی داهاتوو.

پ: لەم وڵاتەدا، چاپکردنی نامیلکەیەك نەك کتێبێك، کارێکە لە پەرچوو دەچێت. یا دەبێ وەکو (ئیبراهیمی گولیستان) بەرهەمەکانی خۆت لەسەر ئەرك‌و بودجەی تایبەتی خۆت چاپ بکەیت، یا ئەوەی ڕووبەڕووی هەزار گیروگرفت ببیەوە تا دەناسرێی، لەم ساڵانەشدا کوا سەرمایەو کوا ئومێدو توانا کە بتوانین خۆمان لەو خەرمەندە ترسناکە قوتار بکەین؟!

باشە، لەوەها ڕەوشێکدا، ئایندەی فەرهەنگ، ئەدەبیات‌و داهێنانە فەرهەنگی‌و هونەرییەکان چۆن دەبینی؟

و: پێموایە وەڵامی ئەم پرسیارەم لە میانی وەڵامەکانی پێشووتری پرسیارە هاوشێوەکانت دابێتەوە، و لێرە دووپاتکردنەوەی بە پێویست نازانم کە ئەگەر لاوێك شتێکی لە دارایی‌و میراتی باوکی بۆ مابێتەوە یا باری دارایی خێزانەکەی باش بوو، باشترە کە یەکەمین کاری خۆی دوای پەسندکردنی چەند کەسێك لە شارەزایان‌و خاوەن قەڵەمان لەسەر ئەرکی خۆی چاپ بکات، ئەگەر ئەو سەرمایەی نەبوو یا باری دارایی باش نەبوو ئەو کاتە دەبێ لە ڕێی ئاشنابوون لەگەڵ خاوەن قەڵەم‌و کەسانی ناسراوو بە هۆی ئەوانەوە ڕێی بەرەو ئامانجەکانی بکاتەوە.

پ. سوپاس مامۆستا! ئێوە منتان بە کۆڕی بڵاوکەرەوەکان ناساند، و لەو ساوە بەردەوام، خەریکم درێژە بەڕێگاکەم دەدەم. ئەگەر هەموو بەڕێزانی خاوەن قەڵەمیش ئەم کارەی جەنابت بکەن، ڕێگا بۆ نەوەی ئێمە هەموار دەبێ. بەڕێزت ئەو شێوازە پەسەند دەکەیت؟

و: نەك هەر ئەو شێوازە پەسەندو رادەسپێرم بەڵکو پیادەشم کردووەو دیسانیش دەیکەم. خوودی خۆم وەك لە سەرەتای ئەم هەڤپەیڤینەدا باسم کرد تا خوالێخۆشبوو (سەعیدی نەفیسی) ژێر باڵی نەگرتم‌و پێشەکیەکی بۆ یەکەمین وەرگێڕانم نەنووسی بۆ نێو قەڵەمڕەوی ئەدەبیات ڕێگەیان پێنەدام‌و کاتێ کە خۆم لەرێی هاوکاریکردنەوە سەلماند ئیدی پێویستم بە هاوکاری‌و ناساندنەوە نەما. بەمپێیە هیوادارم کە هەموو بەڕێزانی خاوەن قەڵەم وابکەن‌و ڕێگا بۆ لاوانی خاوەن بەهرەی نەوەی تازە کە هێشتا کەس پەی بە داهێنان‌و هونەرەکەیان نەبردووە، بکەنەوە.

ساڵحی هێژا، تائێرە قسە لەسەر ئەوە بووە کە من بە کۆڕی لاوانی نەوەی خۆت‌و ئارەزوومەندانی بەرهەمەکانم بناسێنی‌و وەك خۆت لە دەستپێکی ئەم هەڤپەیڤەینەدا وتووتە "قازی کێیە.." بەڵام لەو دەستپێکەدا ناونیشانێکی تریش هەیە کە "چی کردووە؟" و لەو بارەیەوە هیچ پرسیارێکت نەکرد. من خۆم بە تێبینیکردنی ئەو خاڵە، لە تەواوکردنی پێناسەکردنەکەی ئێوەدا!، لیستێك لەکارەکانم لە سەرەتاوە تائێستا لەخوارەوە دەخەمەڕوو تا ئەو خاڵەش ڕوون ببێتەوە کە قازی چی کردووە.

## لیستی ئەو کتێبانەی قازی وەریگێڕاون*

١.کلودی وێڵگەرد- نووسینی ڤیکتۆر هۆگۆ- ساڵی ١٩٤٠ چاپی هەشتەم.

٢.سیناریۆی دۆن کیشۆت- نووسینی سێرڤانتس- ساڵی ١٩٤١ چاپی یەکەم.

٣.زارا یا ئەڤینی شوان- لەنووسینی خودی وەرگێڕ- ساڵی ١٩٤١ چاپی یەکەم.

٤.دان چەرموو- نووسینی جەك لەندەن- ساڵی ١٩٥٢ چاپی دەیەم.

٥.دوورگەی پەنگۆیینەکان- نووسینی ئاناتۆل فرانس- ساڵی ١٩٥٣ چاپی شەشەم.

٦.لە ئامێزی خێزاندا- هیکتۆر مالۆ- ساڵی ١٩٥٥ چاپی چوارەم.

٧.شازادەو گەدا- مارك تواین- ساڵی ١٩٥٥ چاپی هەشتەم.

٨.تێڕوانینێك بۆ سروشتو نهێنیەکانی —پرۆفیسۆر لیۆن بەرتون- ساڵی ١٩٥٦ چاپی دووەم.

٩.شازادە چکۆلە- سەنت ئەگزو پێری- ١٩٥٦ چاپی دەیەم.

١٠.سادە دڵ- ڤۆلتێر -١٩٥٦ چاپی پێنجەم.

١١.دوا ڕۆژی حوکمدراوێك- ڤیکتۆر هۆگۆ- ١٩٥٥ چاپی هەشتەم.

١٢.سەرجەمی دۆن کیشۆت – سێرڤانتس- ١٩٥٧ چاپی چوارەم- دوو بەرگ.

١٣.تاریکترین زیندان- ئیڤان ئۆلبراخت- ١٩٥٨ چاپی چوارەم

١٤.نیە توچکا- داستۆیۆفسکی- ١٩٥٩ چاپی چوارەم.

١٥.مادام بۆڤاری- گوستاڤ فلوبەر -١٩٦٢- چاپی چوارەم- بە بەشداری لەگەڵ بەڕێز (رمزا عەقیلی).

١٦.مەهاتما گاندی- رۆمەن رۆلان- ١٩٦٤ چاپی پێنجەم.

١٧.دۆریتی چکۆلە- چارلز دیکنز-١٩٦٤ چاپی سێیەم- بە بەشداری بەڕێز (عەقیلی).

١٨.زێڕ- بلێز ساندرا- ١٩٦٤ چاپی دووەم.

١٩.مردە لم- چەند چیرۆکێك لە نووسینی (گی دو موپاسان) ساڵی ١٩٦٦.

٢٠.(خرپن)- کە تەواوکەری مردە لمە- ١٩٦٧ چاپی شەشەم.

٢١.دایك- پێرلس باك- ١٩٦٦- چاپی شەشەم.

٢٢.دکتۆر کنوك- ژول رومەن- ١٩٦٦ چاپی چوارەم.

٢٣.نان و شەراب- ئینیا تسیڤ سیلونە- ١٩٦٦ چاپی پێنجەم.

٢٤.مرۆڤەکان و قرژاڵەکان- خۆزۆیە دوکاسترۆ- ١٩٦٧ چاپی پێنجەم.

٢٥.ئازادی یا مەرگ- نیکۆس کازانتساکیس- ١٩٦٩ چاپی شەشەم.

٢٦.لەبارەی تێگەیشتنی ئینجیلەکان- کێری وۆلف- ١٩٦٨ چاپی پێنجەم.

٢٧.ناپلیۆن - تارلێ- ١٩٧٠ چاپی چوارەم.

٢٨.مەسیحی دیسان لەخاچدراو- نیکۆس کازانتساکیس- ١٩٧٠ چاپی شەشەم.

٢٩.وڵاتە نایەککرتووەکان- ڤلادیمیر پوزنەر- ١٩٧٢ چاپی چوارەم.

٣٠. کۆیلە رەشەکان- کایل ئانستوت- ١٩٧٢ چاپی دووەم.

٣١.بەسەرهاتی پێشەوایەکی شەهید- ئینیاتسیڤ سیلونە- ١٩٧٣ چاپی دووەم.

٣٢.سەرمایەداریی ئەمریکا- ماریان دوبوزی- ١٩٧٣ چاپی یەکەم.

٣٣.لاوە سەر بەگۆبەندەکە- ژاك سیرڤۆن- ١٩٧٣ چاپی پێنجەم- بۆ نەوجەوانان.

٣٤.پۆلینا رۆشنایی قەد پاڵی چیا- ئانا ماریا ماتوتە- ١٩٧٤ چاپی هەفتەم- بۆ نەوجەوانان.

٣٥.چیرۆکی منداڵیم- چارلی چاپلن- ١٩٥٦چاپی دووەم- بۆ نەوجەوانان.

٣٦.کارەساتی سوورپێستەکانی ئەمریکا- دی براون- ١٩٧٤ چاپی دووەم.

٣٧.لەگەڵ خێزاندا- هیکتۆر مالۆ- چرکراوەیەکە لە کتێبی (لە ئامێزی خێزاندا)- ١٩٧٧- چاپی سێیەم.

٣٨.قوربانی — مالا پارتێ- ١٩٧٧- چاپی سێیەم.

٣٩.سەگی کین لە دڵ- ئالبێرتۆ واسکز فیگەروا- ١٩٧٧- چاپی دووەم.

٤٠.بێ ریشە- کۆمەڵە چیرۆك- ١٩٧٧- چاپی یەکەم.

٤١.ژنی نانەوا- مارسل پانیول- ١٩٧٧- چاپی دووەم.

٤٢.قەڵای مالڤیل- روبەر مرل- ١٩٧٧- چاپی یەکەم.

٤٣.زۆربای یۆنانی — نیکۆس کازانتساکیس- ١٩٧٨- چاپی یەکەم.

٤٤.بیست وڵاتی ئەمریکای لاتین- مارسل نیدرگانگ- ١٩٧٧- چاپی دووەم- لە سێ بەرگدا.

٤٥.ژانی گەل- ئیبراهیم ئەحمەد- وەرگێران لە کوردییەوە- ١٩٧٩- چاپی یەکەم- بە بەشداری لەگەڵ بەڕێز (ئەحمەدی قازی).

٤٦.پێنج چیرۆك لە هانس کریستیان ئاندرسۆن- ١٩٧٩- چاپی یەکەم- بۆ نەوجەوانان.

٤٧.کۆمۆنی پاریس- لە زانایانی سۆڤیەت- ١٩٨٠- چاپی یەکەم.

٤٨.لە نەبەردێکی گوماناویدا- جان شتاین بەك- ١٩٨١- چاپی دووەم.

٤٩.دایك- ماکسیم گۆرکی- ١٩٨٢- چاپی یەکەم.

٥٠.زەویو کات- ئاولکۆف- ١٩٨٢- چاپی یەکەم- زانستی.

٥١.کلیم سامگین- ماکسیم گۆرکی- ١٩٨٢- چاپی یەکەم- ٤ بەرگ.

٥٢.هەڵکشان بۆ بەرزایی- جۆرزی کوزینسکی- ١٩٨٤- چاپی یەکەم- بە بەشداری لەگەڵ بەڕێز (میرزا ساڵح).

٥٣.لەژێر کۆتدا –ئیڤان وازوف-١٩٨٣- چاپی یەکەم.

٥٤.کوردو کوردستان- واسیلی نیکیتین- لەژێر چاپە.

٥٥.زنجیرەی سێیەم- کوستاس تاکتیس- ١٩٨٤- چاپی یەکەم.

٥٦.دێ کامیرۆن- بوکاچیۆ- لە ژێر چاپە لە دوو بەرگدا.

٥٧.بیرەوەریەکانی وەرگێڕێك- محەمەدی قازی- هێشتا تەواو نەبووە.

٥٨.کورە ڕۆژنامەفرۆشەکە- دۆمی نیك- لەبەردەستە.

*جگە لەو لیستە، ئەو وەرگێڕە بەناوبانگە چەندین کتێبی تریشی وەرگێڕاون کە لە کتێبەکانی تردا تۆمارکراونو ئێمەش بۆ زیاتر شارەزابوونی خوێنەرانی خۆمان وەکو پاشکۆیەك بۆ ئەم لیستەو هەر بە دوای زنجیرەی (٥٨)دا دەیانخەینە بەرچاو:

٥٩.وەیلانو سەرگەردان- ئیڤان وازۆف-١٩٩٠- چاپی یەکەم.

٦٠.مێژووی ئەرمەنستان- هراند پاسدەر ماجیان- ١٩٨٧-چاپی دووەم.

٦١.مێژووی گەلیی ئەمریکا- هارۆێی واسەرمەن- ١٩٥٨- چاپی دووەم.

٦٢.تێلیماك- فرانسوا فنلتی- ١٩٨٩- چاپی یەکەم.

٦٣.چل ڕۆژی موساداغ- فرانتز روفل- ١٩٩٥- چاپی یەکەم.

٦٤.رازی وڵات- میکا ڤالتاری- ١٩٩٧- لە دەستی وەرگێڕان (ئەوکات).

٦٥.بەسەرهاتی وەرگێڕانەکانی من- محەمەدی قازی ١٩٩٤- چاپی یەکەم.

٦٦.گەشت بۆ شاری نموونەیی (ئارمانشار)- ئیتین کابە- ١٩٩٣- چاپی یەکەم.

٦٧.شکستی پاریس- ئیلیا ئەرنبورگ- ١٩٩٠ چاپی یەکەم.

٦٨.سەمەرقەند- ئەمین مەعلوف- ١٩٩٤- چاپ نەکراوە (ئەوکات).

٦٩.سەلاحەدینی ئەییوبی- ئالبێر شاندۆر- ١٩٩٠ چاپی یەکەم.

٧٠-خۆرئاوابوونی فریشتەکان- پاسکال جاکماکیان- ١٩٩٢- چاپی یەکەم.

٧١.کۆرشی مەزن- ئالبێر شاندۆر- ١٩٩٢ چاپی یەکەم.

٧٢.گروپی پێنج کەس‌و کێوەلیەکان- ئینئبیلتون ١٩٩٦- چاپی یەکەم- بە هاوکاریی (سەیفوللای گولکار).

محەمەدی قازی کە کوردێکی خەڵکی مەهاباد بوو، لە وەرگێڕە ناودارەکانی ئێران بوو. دەیان کتێبی لە زمانی فەرەنساییەوە کردووە بە فارسی، لەوانە ڕۆمانی (زۆربا) و (نان‌و شەراب) و (دوا وەسوەسەکانی مەسیح) و گەلێکی‌دی.

ئەم کتێبە ڕۆشنایی خستنە سەر کارەکانی قازی‌و لایەنەکانی هونەری وەرگێڕانە لای ئەو. بەمەش خوێنەر بەچەند ڕەهەندێکی دنیای وەرگێڕان لای محەمەدی قازی ئاشنادەبێت.

بەرگسازی: قادر میرخان




لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم